ناوی کتیب: جۆناسانی   نەورەس
نووسینی: ڕیچارد باخ
بابەت: ڕۆمان
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: بەختیار ئەورەحمان
هەڵەچنی: سارا عەبدوڵڵا
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ:٢٠٠٠  دینار
ژمارەی سپاردن: (١٤٢١)ی ٢٠٠٩
چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی: دووەم ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان - سلیمانی
www.serdam.org

ڕیچارد باخ

# جۆناسانی نەورەس

وەرگێڕانی
ئازاد بەرزنجی
کوردی - ئینگلیزی

سلیمانی - ٢٠٠٩

پێشکەشە بە:

**جۆناسان**

ئەو نەورەسە ڕاستەقینەیەی کە لە ناخی هەر یەکێکماندا دەژی.

# فڕین بەرەو ترۆپکەکان

(ئێوە کاتێک حەز بە بەرزبوونەوە دەکەن،
سەیری سەروو خۆتان دەکەن، بەڵام من بەڕادەیەک
بەرزبوومەتەوە کە ئێستا دەڕوانمە خوار پێیەکانم)
نیچە/ زەردەشت بەمجۆرە ئاخافت

ئەم کتێبە حیکایەتێک نییە بۆ منالآن، بەڵکو حیکایەتێکە بۆ هەموو مرۆڤێک. چیرۆکێکە سەبارەت بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی، سەبارەت بە باڵابوون. سەبارەت بە جەربەزەیی و ڕافزی.

یاخیبوونەکەی جۆناسانی نەورەس یاخیبوونێکە دژ بەو دابونەریت و کۆتانەی کە ڕۆح لە چوارچێوەیەکی تەسکدا قەتیس دەکەن. یاخیبوونێکە لەپێناوی کەشفکردنی ڕەهەندە پەنهانەکانی بوون و ژیاندا، لەپێناوی خۆدۆزینەوەو خولقاندنی بەهای تازەو ماڵئاوایی لە بەها کۆن و بەسەرچووەکان.

جۆناسان دەیەوێت لە چوارچێوەی ئەو ژیانە نزم و بێ بەهایەی بێتە دەرێ کە هەمووی تەرخانە بۆ خواردن و خەوتن و هەڵپەکردن لەپێناوی گوزەراندا. ئەو چیتر نایەوێت وەکو نەورەسەکانی تری ناو گەلە نەورەسەکەی، ژیان بەرێتە سەر، و بەلای ئەوەوە ئەو جۆرە ژیانە جگە لە ژیانی شەرم و نەنگی هیچی تر نییە. بەلای جۆناسانەوە بوون و ژیان مانای قووڵتریان لەناو خۆیاندا حەشار داوە، و ئەمیش دەیەوێت شێوازە نوێیەکانی ژیان تاقی بکاتەوەو بۆ

ئەم مەبەستەش بە ئیرادەیەکی شێلگیرەوە گشت تواناکانی خۆی دەخاتە گەڕو لەوە سڵ ناکاتەوە جارێک و دووان و سیان دووچاری شکست بێت. ئەو دەیەوێت دونیای تازە کەشف بکات و بۆ ئەو ڕێگایەش دەبێت بەرگەی ئەزموونە سەختەکان بگرێت. گەلە نەورەس و دنیادیدەکانی گەلە چەند جارێک ئاگاداری دەکەنەوە کە واز لەو سەرکێشییەی بهێنێت و وەکو هەر نەورەسێکی تر ملکەچی یاساو ڕێساکانی گەلە بێت. بەڵام ئەو گوێ بۆ حەکیم و پیرەنەورەسەکان شل ناکات و تەنانەت کاتێک فێری چەند شێوازێکی تازەی فڕین دەبێت، گەلە لەجیاتی ئەوەی دەستخۆشیی لێ بکەن و ڕێزی لێ بنێن، سووکایەتیی پێ دەکەن، بەڵام ئەو هەر لەسەر یاخیبوونەکەی خۆی سوور دەبێت و دەسبەرداری عەشقی پەیبردن بە حەقیقەتی نوێ و باڵابوون نابێت.

جۆناسان دەڵێت ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووینەتە دونیاوە هەر بخۆین و زاوزێ بکەین، بەڵکو تا بەڕاستی بژین و پەی بە ڕازو نهێنییە جوانەکانی ژیان بەرین و ئازاد بین، نەک کۆیلە.

دواجار، وەکو چارەنووسی هەر یاخیبوویەکی ڕاستەقینە، جۆناسان لەلایەن گەلەوە دەردەکرێت و بە نەفرەت دەکرێت، بەڵام چ باک، ئەو بە تەنیا خۆی بەرەو بەرزاییەکان لە شەقەی باڵ دەدات و ڕۆژ دوای ڕۆژیش زیاتر فێری هونەرەکانی فڕین دەبێت و نوورانی تر دەنوێنێت، بەلای جۆناسانەوە قورسترین جۆری فڕینیش ئەو فڕینەیە کە بەرەو دونیای عیشقی ڕاستەقینەو ئازادیی ڕاستەقینەمان دەبات، و پێویستە هەمووومان فێری ببین، بەلای ئەوەوە، نەورەسەکان چەند

بەرزتر بفڕن، ئەوەندە دووربینتر دەبن.

گەرچی جۆناسان باجی ئەو یاخیبوونەی دەدات و زۆر ئازار دەدرێت، بەڵام دواجار لەو عیشقەیدا بە تەنیا نامێنێتەوەو چەند نەورەسێکی لاو عەودالّی دونیاو ڕێگاکەی دەبن و داوای لێ دەکەن ئەوانیش فێری فڕین بەرەو بەرزاییەکان بکات.. ئیدی ئەوان درێژە بە ڕێگای فڕین و یاخیبوون دەدەن و جۆناسانیش وردەوردە دەچێتە تەمەنەوە، گەرچی وزەو عیشقی هەر بە لاوی دەمێننەوە.

نووسەری ئەم کتێبە (ڕیچارد باخ)ە، کە نووسەرێکی ئەمریکاییەو لە ساڵی (١٩٣٦)دا هاتۆتە دونیاوە، لە هێزی ئاسمانیی ئەمریکاییدا فڕۆکەوان بووەو چەند کتێبێکی سەبارەت بە فڕین نووسیوە.

جۆناسانی نەورەس بە زمانە ئەسڵیەکەی خۆی کە ئینگلیزییە دەیان جار چاپ کراوەتەوە، و هەروەها بۆ سەر دەیان زمانی جیهان وەرگێڕراوە. وا ئێمەش لێرەدا، جگە لە دەقە کوردییەکە، دەقە ئەسڵیەکەش دەخەینە بەرچاوی خوێنەر، و بە ئومێدین گەشتێکی ئەفسووناوی لەگەڵ جۆناساندا بکات.

**ئازاد بەرزنجی**

# فڕین بە شێوازێکی دی

یاخیبوون، هەوڵدان بۆ خۆدیتنەوە لەودیو سنوورە پەسەندکراوەکانەوە، شکاندنی نەریتە چەسپاوەکان، بە کورتییەکەی، تازەکاری و سەرپێچیکردن لە هەڵقەی پیرۆزی دەستەو گەلە، خاسییەتە هەرە دیارەکانی دەقی (نەورەس) پێکدەهێنن. جۆناسان بەرلەوەی قارەمان و ڕابەر و پێشڕەوێک بێ، بەر لەوەی کەڵکەڵەی بوون بە مامۆستا و سەرپەرشتکار و پێشەواییکردن لە سەری دابێ، ویژدانێکی ڕاستەقینەیە کە دەیەوێت بە حەقیقەتی خۆی بگات.

بەپێچەوانەی ئەو وێنانەی کە لەسەر (قارەمان) لە بیرکردنەوەماندا جێگیر بووە، و کاراکتەری ئەو قارەمانەش بریتیە لە مرۆڤێکی (هەڵبژاردە) کە توانای (کۆکردنەوە و ڕێکخستنی کۆمەڵانی خەڵکی) هەیە تا دواجار چارەنووسیان لە (شۆڕش)ێکدا پێکەوە ببەستێتەوە و موعجیزەی مێژوو بەرهەم بێنێ، قارەمانێتی جۆناسان ڕێک و ڕاست لەبەر ئەوەیە کە ئەو لە خۆیەوە لە دەروونی خۆیەوە خواستێ بەرەو شۆڕش و گۆڕان ڕاپێچی دەکا و ڕەوتێکی پێچەوانەیی بۆ بوون بەقارەمان هەڵدەبژێرێ. ڕەنگە ئەمە یەکێ لەو خاڵە زۆر گرنگانە بێ. کە قارەمانێتی جۆناسان لە قارەمانەکانی ناو زەینی ئێمە جوێ دەکاتەوە و پێ دەچێت بە لێوردبوونەوەی

زیاتریش لە جۆناسان، بتوانین گۆڕانێ لە وێنای خۆماندا بۆ قارەمان بهێنینە دی.

تەنیایی، یەکێ لە سیفەتە هەرە دیارەکانی جۆناسانە، لە کاتێکدا قارەمانەکانی خەیاڵ و واقیعی ئێمە (بە ئایینی، سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبیشیانەوە) بە قەڵەباڵغییەکی چڕ، دەست و پێوەندێکی زۆر و غوڵام و نۆکەری بێ ئەندازە چواردەوریان گیراوە، بەڵام تەنیایی جۆناسان بەمانای دابڕانی ئەو لە گەلە تێنەگەین، چونکە جگە لەوەی ئەو چاودێریکەرێکی وردی هەموو ئەو دیاردە و شتانەیە کە لەناو دەستەی نەورەساندا بەدیار دەکەون، بەهەمان شێوەش خۆدوێنەرێکی چوستە، کە هەموو دیاردە و بزاوت و یاسای هۆزی نەورەسان لە مۆنۆلۆگێکی چڕدا هەڵدەسەنگێنێ. کەواتە خۆدواندن سیفەتێکی ترە کە قارەمانێتی جۆناسان لە قارەمانانی تر جوێ دەکاتەوە. ئەو لە تەنیاییەکانیان پتر لە هەرکاتێ شۆڕشگێڕتر و سەرنجڕاکێشتر و کەمدووترە.

کەمدوویی و مۆنۆلۆگ ئەو خەسڵەتانەن کە لە جیهانی عارف و موتەسەوف و لای پاڵەوانی نووسەرە گەورەکانی جیهان دووبارە دەبنەوە: (دویستۆفسکی، پرۆست، ئۆنامونۆ...) دوو حاڵەتن لە سەقەری دەروونیان بۆ پەیوەندیکردنی نەفس یان (خود) بە خۆیەوەو، بۆ چڕکردنەوەی نیگای دەروون لەسەر هەستی خۆی، بەڵام مۆنۆلۆگ توانای ڕەوانبێژیی و خوتبەدانی درێژخایەن کەم دەکاتەوە. ڕستەکان کورتن و بە مانا و دەلالەتی هەمەچەشن بارگاوی بوون، بە جۆرێ کە بەتەنیا جارێ خوێندنەوەو گوێ بۆ گرتن خۆیان بەدەستەوە نادەن، ئەمەش دەقاودەق بەپێچەوانەی ڕەوانبێژی و بەدەم

و دووسی و قسە حازریی دنیایی قارەمانی قەڵەباڵغەوەیە. کێشەی ئەم قارەمانەش ئەوەیە بەردەوام فڕێ دەدات و لە بەرهەمهێناندا دەستەوەستانە. ئەو زۆر سەرسووڕهێنەرانە لە ساتی (ئێستا)دا ڕامان دەگرێ و بە حەپەساوی دەمانهێڵێتەوە، بەڵام توێشەبەرەیەکمان بۆ هەواری داهاتوو ناداتێ. هێندەی دەیەوێ یەکمان خات و لە قاڵبمان بدا، بوارمان بۆ نارەخسێنێ ئازادانە خەیاڵمان چالاک بێت.

کەواتە ئازادی دان بە خەیاڵ خەسڵەتێکی تری کاراکتەری قارەمانبوونە بەشێوە جۆناسانییەکەی. خەیاڵ بەرهەمهێنانی جیهانێکی ئازادە لەپێناوی خۆدەربازکردن لە کۆنترۆڵی گەلەو دەستەی نەورەسان، تاریکستانێ نییە بۆ پەلەقاژێ و سەرلێتێکچوون، بەڵکو نیشتمانێکە بۆ داڵدەدانی خودێتی لەبەردەم شاڵاوی دەستەدا، بکەرێ نەتوانێ خەیاڵکاتەوە نایشتوانێ بوونێکی سەربەخۆی هەبێ، وە کێشەی زۆربەی قارەمانە دینی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان ئەوەیە کە ناتوانن بایەخ بە خەیاڵ بدەن، هەر بۆیەشە بوونی ئەوان بوونێکە لە دوای بوونێکی ترەوە: (کتێبە پیرۆزەکان پەیمان و سەنەدەکان و بەرنامە سیاسییەکان).

جۆناسان نایەوێ لەودیو هیچ بوونێکی ترەوە بێت. ئەو دەیەوێ بوونی یەکەم بەدەست بهێنێ.

بەواتایەکی دی، ئەو شەیدای ئەزموونکردن و تاقیکردنەوە و فێربوونی هەموو ئەو هونەرانەیە کە دەشێت هەر بوویەک لە ماوەی عومری خۆیدا پێیان بگا و فێرببێ. هەر لەبەر ئەمەشە جۆناسان قارەمانێکە (دیسانەوە بەپێچەوانەی قارەمانە زەینییەکانی ئێمەوە) بەتوندی دژ بە (نەمری)یە چونکە نەمری

سیفەتێکە بەپێویست قارەمان ڕاپێچ دەکات لەژێر ڕکێفی شوێن و زەماندا بمێنێتەوە، (ئەمەش ئەو حیکمەتەیە کە جۆناسان لە چیانگ-ی پیرە نەورەسەوە فێری دەبێت).

(نەمربوون). خۆزگەیەکی مەرگخوازانەیە و تەمەننای دەروونە بۆ لەناوبردنی جەستەو کوشتنی مەبدەئی چێژ. دەروونی مەرگخواز ئامادەیی جەستە لە واقیعدا ڕەت دەکاتەوەو دەیکاتە پەیکەرێکی وشک، بەڵام شەیدایی جۆناسان بۆ تاقیکردنەوەی بەردەوام و شکاندنی سنووورە دیارەکان، لەهەمانکاتیشدا ئامادەکردنەوەی جەستەیە لە واقیعدا، ئەو ژیان بە پانتاییەکی نەبڕاوەی ئەزمووون و تاقیکردنەوەی توانا و حەزەکانی دەزانێت و ناشیەوێت لە پاش مردنی لە بارەیەوە (واتەوات بڵاوبکەنەوە و بیکەن بە خواوەند)، چونکە ئەو تەنیا (نەورەسێکە حەز بە فڕین دەکا) و هیچی تر...

تێکەڵبوونی جۆناسان لەگەڵ نەورەسە یاخییەکانی تر و کۆکردنەوەیان، لە نیەتی بوون بە سەردار و ڕابەر و فەرمانداریکردنیانەوە نەهاتووە.

چونکە وەکو پێشتر هێمای بۆ کرا: جۆناسان سیفاتی ئەو کاراکتەرانەی زۆر بەکزی تێدان و چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێ تەختێ داگیر بکا!.. ئەوەی ئەو لەم هاودەمیی و نزیکبوونەوەیە چاوەڕێی دەکات، گۆڕینەوەی ئەزموونەکانە لەناو دەستەی نەورەسەکاندا و کەڵەکەکردنی سەرمایەیەکی زۆرترە لە پێناوی فڕیندا بەشێوازێکی تر، نەک بەرهەمهێنانەوەی کەسێتی خۆی لە کەسێتی ئەوانی تردا. یاخود موتوربەکردنی خەسڵەتەکانی خۆی لەسەر پانتایی بوونی ئەوانی تر (کە دیسانەوە ئەمە سیفەتێکی دیاری قارەمانەکانی دنیای ئێمەیە)، چونکە گەر

ئەمەی بکردایە، ئەوا دەبووە دیکتاتۆرێ بەسەر خەیاڵ و جیاوازییەوە. دەبووە سەردارێکی تری قەبیلەی نەورەسان و ئەرکی سەرەکیشی دوای تێربوونی چێکەڵدانەی، دەبووە پارێزگاریکردنی ئەو یاسایانەی پێشتر لێیان هەڵگەڕابووەوە!. بۆیە بە بارێکی تردا دەتوانین بڵێین: شۆڕش و یاخیبوونی جۆناسان شۆڕشێکە لەپێناوی هێشتنەوەی جیاوازیدا و ڕۆچوونێکە بە ناخی (خود)دا بۆ بەرگریکردن لە سەربەخۆیی خۆی. جا ئەگەر هەر حەزیش بکەین ناوێ بۆ جۆری قارەمانی جۆناسانی بدۆزینەوە، ئەوە من پێشنیاری ئەوە دەکەم ئەو ناوە (قارەمانی ئاگایی) بێت، چونکە تەنیا دۆزینەوە و گەیشتنە بە ئاگاییەکی جۆناسانی کە ڕزگارمان دەکا لە دنیای پڕفریووی قارەمانانی ئەمڕۆ.

پێم وایە هەر ئەمەشە بۆتە ئەنگیزەی هاوڕێی پڕکار و بەڕێزم (ئازاد بەرزنجی) تا بوارمان بۆ برەخسێنێ لە ڕێگەی زمانی کوردییەوە بە دنیای جۆناسان ئاشنا ببین و بە خۆماندا ڕۆچین..

بۆچی نا؟ ڕەنگە فێر بین بیر لە شێوازێکی تری فڕین بکەینەوە.

**ڕێبوار سیوەیلی - دانیمارك**

بەیانی بوو، خۆرە لاوەکە تۆزی ئاڵتوونی بەسەر وردە شەپۆلەکانی هێوریی دەریادا دەپرژاند.
بەدرێژایی میلێک لە کەنار دەریاکە، بەلەمەکانی ڕاوەماسی بەسەر ڕووی ئاوەکەوە جێی خۆیان خۆش کردبوو. ئارەزووی قاوەڵتی لە نێو گەلەی نەورەساندا جۆش و خرۆشی سەندبوو. هەزاران نەورەس بەسەر وردە خۆراکی سەر ئاو کەوتووی ناو دەریاکەدا، بەملاولادا باڵەفڕێیان دەکردو دەگەڵ یەکتردا لە پیلەدا بوون. ڕۆژێکی تری پڕ ژاوەژاو بەڕێوە بوو. جۆناسانی نەورەس دوور لە ڕۆخی ڕووبارەکەو بەلەمەکان، لە چۆڵەوانییەکدا سەرگەرمی مەشقی فڕین بوو. لە بڵندایی سەد پێوە، پێیە پەڕدارەکانی هێنایە خوارەوەو دەنووکی بۆ سەرەوە بەرز کردەوەو، بۆ هەڵگێڕانەوەی باڵەکانی کەوانەیەکی بە ئازاری پێک هێنا، ئەم کەوانەیە بۆ ئەوە بوو کە لەسەرخۆ بفڕێت و، ئەوە بوو هێند لەسەرخۆ دەفڕی کە با بەڕوویدا دەیچرپاندو، ئۆقیانووسەکەش لە خوارەوە هێمن دەینواند. بەڕادەیەک هەستەکانی خۆی چڕ کردبوونەوە کە چاوەکانی قیچ ببوونەوە، هەناسەی لە سینەی خۆیدا بەند کردبوو، تەواوی تین و تاوی خۆی کۆکردەوەو کەوانەکە کەمێک فراوانتر بوو. هاوئاهەنگیی باڵکانی شێواو لە جووڵە کەوت و بەربۆوە.

هەروەکو دەزانن نەورەسەکان لە کاتی فڕیندا هەرگیز نالەنگێن و لە جووڵە ناکەون. وەستان لە کاتی فڕیندا؛ لە فەرهەنگیاندا نەنگیو شوورەییە. وەلێ جۆناسانی نەورەس کە بێ هیچ شەرمێک سەرلەنوێ باڵەکانی لە کەوانەیەکی تەواو لەرزێنەردا کردەوە، هێدی هێدیو بۆ جارێکی دی لە جوولە کەوتەوە.

ئەم باڵندەیەکی ئاسایی نەبوو. زۆربەی نەورەسەکان هەر ئەوەندە خۆیان ماندوو دەکەن کە فێری زانیارییە سادەکانی فڕین بن، واتە چۆن لە ڕۆخی دەریاوە بۆ گەڕان بەدوای خۆراکدا بفڕن و بگەڕێنەوە. بەلای زۆربەی نەورەسانەوە ئەوەی گرنگە؛ پەیداکردنی خۆراکە نەک فڕین، بەڵام بەلای ئەم نەورەسەوە گرنگ فڕین بوو نەک پەیداکردنی خۆراک. جۆناسانی نەورەس لە هەموو شتێک زیاتر سەوداسەری فڕین بوو.

ئەو دەیزانی مەلەکانی دیکە لەم ڕێیەدا هاوبیری نابن. تەنانەت باوک و دایکیشی ترسیان لێ نیشتبوو؛ چونکە جۆناسان تەواوی ڕۆژی بە تەنیایی بەسەر دەبردو، لە بەرزاییەکی کەمیشەوە سەدان جار سووکەفڕینی ئەنجام دەدا.

بۆ نموونە ئەو نەیدەزانی بۆچی کاتێک لە بەرزاییەکی کەمتردا کە بە باڵە نیوە کراوەکانییەوە بەسەر ئاوەکەدا دەفڕی، گەر تەقەلای بکردبایە؛ دەیتوانی ماوەیەکی زیاتر لە هەوادا بمێنێتەوە. ئەو کاتانەی قاچەکانی بەنێو ئاوی دەریاکەدا شڵپەشڵپیان دەکرد؛ فڕینە سووکەکانی کۆتاییان نەدەهات. فڕینەکەی وەختێ دەگەییە ئاکام کە قاچەکانی توند بە ژێر

سکی خۆیەوە دەنووساندو، جەستەی بەر ڕووی دەریاکە دەکەوت و ڕێگایەکی درێژی لە دواخۆیەوە جێ دەهێشت، کاتێک پێیەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و بەرەو کەنار فڕیو مەودایەکی درێژی بەسەر لمەکەدا بڕیو پاشان بە شەقاونانەوە گەڕایەوە؛ هەنگینێ.. باوک و دایکی بەڕاستی ترسان.

دایکی وتی: ((بۆ جۆناسان.. بۆ؟! بۆچی لات نەنگە وەکو باڵندەکانی دی یەکێک بیت لە گەلە؟! بۆ واز لە فڕینی کورت ناهێنیت بۆ سەقاقوش و شینە شاهۆکان؟ بۆ دەم لە هیچەوە نادەیت جۆن؟ ئەوەتانێ بوویت بە مشتێک پەڕو ئێسقان!)).

جۆناسان وتی: ((دایە، ئەوەم بەلاوە گرنگ نییە، با بووبم بە مشتێک پەڕو ئێسقان. من تەنها دەمەوێ بزانم لە هەوادا چیم پێ دەکرێو چیم پێ ناکرێ. تەنها ئەوەندەو بەس. من تەنها دەمەوێ ئەوە بزانم)).

باوکی بە میهرەبانییەوە وتی: ((گوێ بگرە جۆناسان، ئەوەندەی نەماوە بۆ زستان ئەوسا ئەو بەلەمانە تەنها چەند دانەیەکیان دەمێننەوەو، ماسییە مەلەوانەکانیش بەرەو قووڵایی هەڵدێن. ئەگەر هەر پێویستە فێر بیت؛ کەواتە فێری پەیداکردنی خۆراک بە. فڕین خۆشە، بەڵام خۆت دەزانیت سووکە فڕین نان نییە تا بیخۆیت. ئەوەت لەیاد نەچێت کە فڕین بۆئەوەیە بتوانیت خۆراک پەیدا بکەیت)).

جۆناسان بە گوێڕایەڵییەوە سەری ڕاوەشاند. ڕۆژانی دواتر هەوڵی دا وەکو نەورەسەکانی دی ڕەفتار بکات. بەڕاستیشی بوو.

لەگەڵ گەلەدا و لە نزیک لەنگەرگەو بەلەمەکانی ڕاوەماسییەوە بەناسازی دەیقیژاند و پەلی دەکوتا.

هەڵمەتی بۆ پارچە نان و ماسییەکان دەبرد، بەڵام هەرچەندیَ کۆشا؛ نەیتوانی بەمجۆرە هەڵبکات. بیری کردەوە کە تەواوی ئەم شتانە بیَ بەهان، ئەو ماسییەی کە هەروا بەئاسانی چنگی نەکەوتبوو؛ فڕێیی دا بۆ پیرە نەورەسێکی برسی کە دوای کەوتبوو. لەدڵی خۆیدا وتی: ((دەمتوانی ئەم ماوەیە خۆم بە فێری فڕینەوە خەریک بکەم، زۆر شت هەن کە پێویستە فێریان بم)).

ئەوەندەی پیَ نەچوو دیسانەوە جۆناسانی نەورەس پەنای بۆ تەنیایی بردەوە. دوور لە دەریا، برسی وکامەران؛ سەرگەرمی فڕین بۆوە.

گرنگ تیژفڕین بوو. ئەوە بوو دوای هەفتەیەک مەشق زۆر زیاتر لەو نەورەسانە فێر بوو کە لە فڕیندا تیژ بوون، لە بڵندایی هەزار پێوە توند باڵەکانی لێک داو وەک تیشکێکی پرشنگدار شەیدایانە ڕووەو شەپۆلەکان دابەزیو، تێگەیشت بۆچی نەورەسەکان لە شاڵاوی بەهێزو قووڵ سڵ دەکەنەوە. تەنها لە ماوەی شەش چرکەدا توانیی هەفتا میل لە کاژێرێکدا ببڕێت، لەو خێراییەشدا پاراستنی هاوسەنگیی باڵلێکدان لەگەڵ بەرەوژوور فڕیندا سەختە.

گەرچی وریا بوو، تەواوی هێزیشی دەخستە کار، بەڵام چەند جارێک لەو خێراییە فرەیەدا هاوسەنگیی باڵەکانی تێکچوو.

بە بەرزیی هەزار پێ بڵند بۆوە. سەرەتا هەموو توانای خۆی گرد کـردەوە، ئینجا بـزاوت. باڵی لێک داو ڕاست بـەرەوژووور هەڵمەتی برد. پاشان هەر ئەوەندە باڵی چەپی لە کاتی بـەرەوژووردا لە جووڵە کەوت؛ بە سەختی بەلای چەپدا خولایەوە. باڵی ڕاستی نەبزواند تا چاک ببێتەوە. ئینجا وەک زمانەی ئاگرو بە تەقلەوە پشتاوپشت بەرەو لای ڕاست پێچی کـردەوە. وەختێ بــەرەوژوور فـڕی؛ نەیتوانی وەک پێویست ئاگای لە خۆی بێت. دە جار هەوڵی دا، بەڵام هەر دە جارەکە کە خێرایی خۆی دەگەیاندە حەفتا میل لە کاژێرێکدا، وەک نەورەسێکی ڕەمـەکی باڵەکانی شێواو دەینواند و بێئەوەی بتوانێ جڵەوی خۆی بکات؛ دەکەوتە نێو ئاوەکەوە. سەرئەنجام لە کاتێکا لە هەندێ شوێنی لەشیەوە ئاو دەتکا، بیری کردەوە ((پێویستە لە کاتی تیژفڕیندا نەهێڵم باڵەکانم ببزوێن. سەرەتا باڵەکانم لێک دەنێم تا خێراییم دەگاتە پەنجا میل، ئینجا دەیانوەستێنم ونایانبزوێنم)).

لە بەرزایی دووهەزار پێوە دەستی پێ کردەوە. بەتوندی بەرەوخوارەوە هوروژمی برد، دەنووکی ڕێک بۆ خوارەوە و باڵەکانیشی ڕاست و کراوە بوون، بۆ گەیشتن بەو مەرامە؛ پێوستی بە هێزێکی فرە بوو، سەرەنجام هەوڵەکەی گەیشتە ئاکام و خێراییەکەی گەیشتە نـەوەد میل لە دە چرکەدا. جۆناسان ڕیکۆردێکی جیهانیی نوێی لە فڕینی نەورەساندا تۆمار کرد. بەڵام ئەم سەرکەوتنە هێندەی نەخایاند. هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی جووڵە تازەکەیدا و، لەهەمانکاتدا کە گۆشەی باڵەکانی گۆڕی، دووچـاری هەمان تەنگوچەڵەمە بۆوە، لە خێرایی نەوەد میل لە کاژێرێکدا؛ وەکو دینامیتێک کە

کڵاوەکەی بەر شتێک دەکەوێت؛ کەوت. جۆناسانی نەورەس لە ئاسماندا هاوسەنگیی خۆی لەدەست دا و کەوتە سەر ئاوی دەریاکە کە لە زبریدا لە خشت دەچوو، تێک شکا. وەختێ هاتەوە سەر خۆی؛ هەوا تاریک ببوو، ئەمیش بەسەر ڕووی زیوینی دەریاکەوە مەلەی دەکرد. باڵەکانی دەتوت دوو کۆنە ستونی قورڕقوشمین، بەڵام باری تێکشکانەکە بەسەر پشتیەوە زۆر قورستر دەینواند. تیا مابوو، تاقە ئارەزووی ئەوەبوو کە بریا ئەو قورسییەی ڕۆحی دەگوشێت بە ڕادەیەک دەبوو؛ وردەوردە بەرەو قووڵایی دەریاکە دەیبردو ئیدی کۆتایی بە هەموو شتێک دەهێنا.

کاتێ لەسەر ڕووی ئاوەکەو بە قووڵاییەکی کەم خۆی نوقم کرد، دەنگێکی دوورو نامۆ گیانی تەنییەوە ((ناگەمە مراد، من نەورەسێکم وهیچی دی. سروشتم توانامی دیاری کردووە، گەر قەرار بووایە فێری فڕینی زیاتر بوومایە، دەبوایە مێشکم بەجۆرێکی هۆشیارانەتر بخولقابایە. گەر پێویستم بە تیژفڕین بووایە، دەبووایە باڵەکانم وەکو باڵی باز کورت بوونایە و شکارچیی مشکان بوومایە نەک هی ماسی. باوکم ڕاست دەکات. پێویستە لەوە زیاتر خۆم گێل نەکەم، پێویستە لە تەنیشتماڵەوەو لەگەڵ گەلە نەورەسەکەمدا بفڕم و بە بەشی خۆم قایل بم، وەک هەر نەورەسێکی تری بەندیو بەسزمان)).

دەنگەکە نەماو جۆناسان ئەم قسانەی بە گوێدا چوو. شەوانە ماڵی نەورەس کەنار دەریایە...

سوێندی خوارد کە ببێتەوە بە نەورەسێکی ئاسایی. ئەمە دەبووە مایەی خۆشحاڵیی نەورەسەکانی دی.

شەکەت و ماندوو لە ئاوە تاریکەکە چووە دەرێ و بەرەو وشکاییەکە فڕی. بەو زانیاریانە خۆشحاڵ بوو کە دەربارەی فڕین فێر ببوو.

با فڕینێکی زۆر بەرزیش نەبێ، ئەو خۆشحاڵیەی لە خەم و کەسەرەکانی کەم کردەوە.

ناکاو لە دڵی خۆیدا وتی: ((بەڵام نەء... ئەو ڕێگایەی گرتمە بەر تەواو. تازە ئەوەی فێریشی بووم بە من چی! منیش وەک ئەوانی دی تەنها نەورەسێکم و هیچی دی. هەروەکو ئەوانیش دەفڕم)). پاشان زۆر بە سەختی، سەد پێ بەرەو ئاسمان بڵند بۆوە و بۆ گەیشتن بە کەنار بە هێزێکی پترەوە باڵەکانی لێک نا.

هەستی بە ئاسوودەیی کرد بۆ ئەو بڕیارەی داویەتی کە ئیتر وەکو نەورەسەکانی تری گەلە ڕەفتار بکات. ئەوەتانێ لەمەودوا هەست بەو هێزە ناکات کە بۆ فێر بوون هانی دەدا. ئیدی نە نەبەرد لەگۆڕێیەو نە تێکشکان. ئەمەش شتێکی ئارامبەخش بوو، بیرنەکردنەوە.. فڕین بەنێو تاریکیدا و بەرەو ڕووناکیەکانی کەنار دەریا.. هێندەو بەس. لە ناخیدا دەنگێکی قووڵی هۆشیارکەرەوە بەرز بۆوە ((تاریکی!! نەورەسان هەرگیز لە تاریکیدا نافڕن!))

بەڵام جۆناسان هێند وریا نەبوو ئەو دەنگە ببیستێت، بەڵکو ڕامابوو ((ئای کە دیمەنێکی جوانە. مانگ وتیشکی ڕووناکیەکان لەسەر ڕووی ئاوەکە دەچریسکێنەوە و، ڕۆشنایی چراکانی دەریا دەتارێنن. هەموو شتێک هێمن و خامۆشە!))

((نزم بەرەوە! نەورەسان هەرگیز لە تاریکیدا نافڕن. گەر قەرار بووایە لە تاریکیدا بفڕیبایتایە

دەبووایە چاوەکانت چون چاوی کوندەپەپوو بوونایەو، مێشکت پێشکەوتووتر بووایە! دەبووایە باڵەکانت وەک باڵی باز کورت بوونایە)).

لە دورِ شەوداو لە بڵندیی سەد پێوە، جۆناسانی نەورەس پێڵووەکانی لێک نا. ڕەنگی ئازارو هزری گۆڕا.

((دوو باڵی کورت وەک باڵی باز!))

((ئەمەیە وەڵامـی ڕاستەقینە بۆ من. ئای کە گێل بووم. پێویستم بە باڵی بچووک و باریکە، بۆیە دەبێ بەشی زۆری باڵەکانم بنووشتێنمەوە و، تەنها بە نووکی باڵەکانم بفڕم! دوو باڵی کورت!))

دوو هەزار پێ لە دەریا تاریکەکەوە بەرز بۆوە، بە بێ ئەوەی بهێڵێ سامی تێکشکان و مەرگ پەی بە دڵی بەرێت.

بەشی پێشەوەی باڵەکانی بەلای جەستەیدا ڕاکێشاو تەنها خەنجەری باریک و چەماوەی نووکی باڵەکانی ڕەها کرد تا لە بادا بکرێنەوەو، لەپڕێکدا بە گوژم ڕاستەوخۆ بەرەوخوارەوە دابەزی.

با لە سەریدا توند دەینەڕاند. حەفتا میل لە کاژێرێکدا، نەوەد، سەدو بیست و بگرە پتر. گوشاری سەر باڵەکان لە خێرایی سەدو چل میل لە کاژێرێکدا، کەمتر بوو لە گوشاری سەر باڵەکانی لە خێرایی حەفتا میلدا. قەراغ باڵەکانی خۆی تۆزێک خوار کردەوەو بەسەر دابەزینەکەیدا زاڵ بوو، ئینجا کەوتە سەر ئەو شەپۆلانەی کە هێشتا هەر لە هەڵکشاندا بوون. جۆناسان لەبەر تریفەی مانگەشەودا لە گوللەتۆپێکی خۆڵەمێشی دەچوو.

چاوەکانی ڕووەو با قیچ کردەوەو کەیفی هاتێ (سەدو چل

میل لە کاژێرێکداو بە زاڵبوونێکی تەواویشەوە! ئەگەر لەبری ئەوەی لە بەرزیی دوو هەزار پێوە خۆم فڕێ بدەم، ببێتە پێنج هەزار پێ، ئاخۆ ئەو کات خێراییەکەم بگاتە چەند؟!!)

ئەو سوێندەی لەبیر چووبۆوە کە پێشان خواردی و، لەگەڵ بایە توندەکەدا ئاسەواری نەما.

وێڕای ئەوەش لە ئاست ئەو سوێندشکێنییەی خۆیدا هەستی بە گوناه نەدەکرد.

((ئەم جۆرە سوێندانە تەنها بۆ ئەو نەورەسانە باشە کە گوێڕایەڵییان پێ خۆشە. ئەوەی توانیبێتی لە فڕیندا دوندە بەرزەکان بڕەتێنێ، پێویستی بەم تەرزە سوێندو پەیمانانە نییە)).

لەگەڵ خۆرکەوتندا جۆناسان دەستی بە مەشقەکانی دەکرد. کە لە بەرزیی پێنج هەزار پێوە دەیڕوانییە خوارەوە؛ بەلەمەکانی ڕاوەماسی وەک چەند خاڵێکی پەرش بەسەر ڕووی ئاوەکەوە دەهاتنە پێش چاوی. گەلە نەورەسی بەیانیش کە لە هەورێکی تاروتەنکی لە زەڕەی تۆز پێکهاتوو دەچوو، بە دەوریاندا دەسووڕانەوە.

خۆشحاڵ و شاد بوو بەوەی زۆر نالەرزێ. شانازیی بەوەوە دەکرد کە توانیوێتی بەسەر ترسەکەی دەروونیدا زاڵ بێت. بێ زۆر لەخۆکردن شاپەڕەکانی لەئامێز گرت.

نووکی باڵە گۆشەدارە کورتەکانی کردەوەو ڕاست بەرەو دەریا وروژمی برد. تا بەرزیی چوار هەزار پێ، کە گەیشتبووە دوا خێرایی؛ باهۆزێکی گەلێ توند هەڵیکردبوو، یارمەتیی توندفڕینی نەدەدا، پاشان ڕاست بەرەو خوار داکشا، بەخێرایی دووسەدو چواردە میل لە سەعاتێکدا. دەیزانی گەر

لەو ساتانەدا باڵەکانی بکرێنەوە، دەبێتە ملیۆنەها پارچەو هەپرون بە هەپرون دەبێ، وەلێ هەر بەرەو خوار ملی دەنا.. تیژفڕین هێزو تین بوو، تیژفڕین بەختەوەری بوو. جوانییەکی پەتی بوو.

کە گەییە بەرزیی هەزار پێ، دەستی بە فڕینی ئاسۆیی کرد. لەدورِ هاژوهوژی ئەو باهۆزەدا نووکی باڵەکانی سەدایەکی نەرم و ئارامی هەبوو، قایخ و پۆلە نەورەسەکان چون تیرەستێرەیەکی کشاو بە بەرچاویدا گوزەریان دەکرد، نەیدەتوانی بوەستێت، تەنانەت نەیدەزانی لەو خێراییەدا چۆن بسووڕێتەوە. بەر هەرچییەک بکەوتبایە، یەکسەر مەرگ دەبووە میوانی، بۆیە پێڵوەکانی لێک نا.

ڕووداوی ئەو بەیانییە ئەوە بوو کە یەکسەر دوای خۆرکەوتن، جۆناسانی نەورەس، ناگەهان بەنێو گەلە نەورەسی بەیاندا تێپەڕیو بە خێرایی دووسەدو دوانزە میل لە کاژێرێکداو بە پێڵووی نووقاوەوە، بەنێو هاژەی توندی باو پەڕو باڵدا دەرچوو، ئەمجارە بەخت یاری کەڵە نەورەس بوو، کەس تیا نەچوو.

ئەو ساتانەی دەنووکی بەرەو ئاسمان بوو، هێشتا بە خێرایی سەدو شەست میل لە کاژێرێکدا دەفڕی.

وەختێ خێرایی خۆی تا سەدو بیست کەم کردەوە، دووبارە باڵەکانی کردەوە، بە دووریی چوار هەزار پێ لە خوار باڵەکانییەوە بەلەمەکان دەتوت وردەنانی سەرئاوکەوتووی ناو دەریاکەن.

تەنها بیری لە سەرکەوتن دەکــردەوە.... دوا تیژفڕین! نەورەسێک و بە خێرایی دووسەدو چواردە میل لە کاژێرێکدا! ڕیکۆردی شکاندبوو، تاقە ساتێکی مەزن و بێ هاوتا بوو لە مێژووی گەلەدا. ئەو ساتانە جۆناسان چاوی بە چاخێکی نوێدا هەڵدەهێنا.

بە فڕینی بەرەو فەزای دەڤەری مەشقی و، نوشتاندنەوەی باڵەکانی بۆئەوەی لە بەرزیی هەشت هەزار پێوە خۆی توند فڕێ بدا؛ ناکاو پەی بە نهێنی سووڕانەوە برد.

پەی بەوە برد گەر بێتو پەڕێک لە پەڕەکانی نووکی باڵی تۆزێک ڕاتەکێنێت، دەتوانێ لە خێراییەکی زۆردا بەپەلە پێچ بکاتەوە. بەرلەوەی ئەمە فێر ببێت پەی بەوە بردبوو ئەگەر لەو خێراییەدا لە پەڕێک زیاتری بجووڵێنێت، وەک گوللەی تفەنگێک بەدەم خولانەوەوە دەکەوێت.

بەمجۆرە جۆناسان یەکەم نەورەس بوو لە دونیادا پەی بەم هونەرانەی فڕین بەرێت.

ئەو ڕۆژەکانی خۆی بە گفتوگۆ لەگەڵ نەورەسەکانی تردا بەفیڕۆ نەدا، بەڵکو تا ئەو دەمەی خۆر ئاوا بوو، فێری گەلێ هونەری تر بوو؛ تەقلەی بازنەیی، سووڕانەوەی لەسەر خۆ، سووڕانەوەی بـەرەوژوور، سووڕانەوەی پێچەوانەو، گوشارخستنە سـەر (سـەر) لەکاتی بەرەوپێش فڕیندا و سووڕانەوەی فڕفڕۆکەیی.

❊ ❊ ❊

وەختێ جۆناسانی نەورەس گەیشتەوە کن گەلەی دەم ڕۆخ؛ شەو بەسەر چوو بوو. تەواو کەنەفت و وڕو کاس بوو. بەم حاڵەشەوە بەر لەوەی بنیشێتەوە بە شادییەوە تەقلەیەکی لێدا، تەقلەیەکی ناگەهان، بیری کردەوە ((ئەوان گەر بزانن من ڕیکۆردم شکاندووە لە خۆشیان دەیکەن بە شایی. ئێستا ژیان لام چەند پڕ ماناتر بووە. بەمجۆرە لەبری گەڕانە یەکتەرزەکانمان بەناو بەلەمەکانی ڕاوەماسیدا و پێچەبەدەورەیان، بەهانەی ترمان هەیە بۆ ژیان.. دەتوانین خۆمان لە داوی نەزانین ڕەها بکەین. دەتوانین ببینە بوونەوەری سەرفرازو هۆشمەندو کارزان. دەتوانین ئازاد بین. دەتوانین فێری فڕین بین)).

سالآنی ئایندە مژدەبەخش و درەخشان خۆیان دەنواند.

❊ ❊ ❊

وەختێ جۆناسان نیشتەوە سەر زەوی، گەلە نەورەس شوورایان ساز کردبوو. کۆڕی کۆبوونەوەیان گەرم بوو. وا پێدەچوو کاتێکی زۆر بەسەر کۆبوونەوەیاندا تێپەڕیبێت و هەر چاوەڕێی ئەم بووبن.

((جۆناسانی نەورەس لە ناوەڕاستدا بوەستە!))

قسەکانی سەری گەورەی گەلە ئاوازێکی وشک و ڕەسمیی هەبوو. وەستان لە ناوەڕاستدا دوو مانای هەبوو؛ کەتن و شوورەیی، یان ڕێزلێنان و سەربەرزی. بە سەربەرزی وەستان لە ناوەڕاستدا ڕێوڕەسمێک بوو بۆ ناساندنی کەڵە ڕابەرانی نەورەسان، بیری کردەوە ((پێدەچێت گەلەی ئەم

سپێدەیە ڕیکۆرد شکاندنی منیان بینیبێت! بەڵام من پێویستیم بە ڕێزلێنان نییە.

حەز بە ڕابەرایەتی ناکەم. تەنها دەمەوێ ئەوەی کە پەیم پێ بـردووە لەگەڵ ئەوانی تـردا بەشی بکەم و، ئەو ئاسۆ دوورانەی کە لەبەردەمی هەموواندایە؛ بیانخەمە ڕوو)).

هەنگاوێک چووە پێشەوە...

سالاری گەلە وتی: ((جۆناسانی نەورەس! لە ناوەڕاستداو لەناو هەموو نەورەسەکانی تردا بوەستە تا ببیتە پەند بۆ ئەوانی دی، چونکە تۆ کەتنی گەورەت کردووە!)).

وەک ئەوەی خۆی بە قەراغی بەلەمێکدا دابێت، قەڵەمی ئەژنۆی شکا، گیڤی پەڕەکانی نیشتەوە،

نەڕەیەک لە گوێیدا دەنگی دایەوە.

((لە ناوەڕاستدا بوەستم تا ببمە پەند؟ مەحاڵە! ئەی ڕیکۆرد شکاندنەکەم؟! ئەمانە تێناگەن!

بە هەڵەدا چوون! بەهەڵەدا چوون!)).

((..... لەبەر کەمتەرخەمی و خۆدزینەوە لە بەرپرسیاری و..)). دەنگە بەهەیبەت و یەکئاوازەکە بەردەوام بوو ((سەر پێچیکردن لە دابونەریت و دەستدانە کارێک کە لە بنەماڵەی نەورەسان ناوەشێتەوە..))..

وەستان لە ناوەڕاستدا بۆ بوونە عیبرەت مانای ئەوە بوو کە لە کۆمەڵگای نەورەساندا دەردەکرێ و بەرەو ((گاشەبەردە دوورەکان)) دووردەخرێتەوەو دەبێ لەوێ بە تاقی تەنیا ژیان بەرێتە سەر.

((.... جۆناسانی نەورەس، ڕۆژێک دێ تێبگەیت کە هەڵاتن لە بەرپرسیاریو تێنەگەیشتن لێی بێهودەیە! ژیان هێشتا

شتێكی نەزانراوەو ناسینی ئەستەمە. تەنها ئەوە نەبێ كە ئێمە بۆیە هاتووینەتە دنیاوە تا بخۆین و، چەند لە تواناشماندایە ژیانی خۆمان بپارێزین)).

تا ئێستا هیچ نەورەسێك نەیوێراوە لەبەردەم شوورای گەلەدا زمان هەڵبێنێتەوەو وەڵام بداتەوە، بەڵام جۆناسان هەڵی دایە: (تێنەگەیشتن لە بەرپرسیاری؟! براكانم چ نەورەسێك لەو نەورەسە زیاتر هەست بە بەرپرسیاری دەكات كە ماناو ئامانجێكی بەرزتری بۆ ژیان دۆزیوەتەوەو بە دوویدا عەودالە؟! هەزاران ساڵە ئێمە لەسەر قەراغەنان و سەرەماسی یەكتری دادەپاچین، بەڵام ئێستا من توانیومە ئامانجی دی بۆ ژیان بدۆزمەوە؛ فێربوون، پەیبردن بە شتی نوێ، ئازادی! بوارم بدەن، بهێڵن ئەوەی فێری بووم پیشانتانی بدەم..)).

گەلە وەها نوتقیان لە خۆیان چنیبوو، دەتوت بەردن. پاشان نەورەسەكان لەگەڵ یەكتر كەوتنە چپەچپ ((یەكێك لە براكانمان تێك چووە)) هەموو پێكەوە گوێی خۆیان گرت و پشتیان تێكرد.

جۆناسانی نەورەس ڕۆژانی ئایندەی بە تەنیا بەسەر برد. بەڵام گاشە بەردە دوورەكانی تێدەپەڕاند. خەمی ئەم تەنیایی نەبوو. ئەوەی گینگڵی بەم دەدا ئەوە بوو كە نەورەسەكانی دی ڕووی خۆیان لەو فڕینە شكۆدارە وەردەگێڕا كە لەبەردەمی هەر یەكێكیاندا بوو. نەیاندەویست چاویان بكرێتەوەو فێری بینین بن.

ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر فێر دەبوو. فێر بوو چۆن لەڕێی گوژمی بەگوڕەوە ماسیی جوانی وەها بدۆزێتەوە كە لە قووڵایی دە پێ لەژێر ئاوەكەوە مەلەیان دەكرد.

جۆناسان ئیدی لە ژیانیدا پێویستی بە بەلەمەکانی ماسیو وردەنانی پاشماوە نەمابوو. فێر ببوو چۆن لە ئاسماندا بنوێ، چۆن لە کزەبای شەواندا بفڕێ کە دوور لە کەناری دەریا هەڵی دەکرد.

فێر بوو چۆن لە ئاوابوونی خۆرەوە تا هەڵاتنی؛ سەد میل ببڕێت.

بە هەمان توانای بەسەرخۆدا زاڵبوونەوە؛ بەنێو تەمومژی چڕی سەر ڕووی دەریادا دەفڕی و پاشان بەرەو ئاسمانە ڕووناک و درەخشانەکان لە شەقەی باڵی دەدا.. هەر ئەو دەمانەی نەورەسەکانی دی لەسەر زەوی دەمانەوە و جگە لە تەنکە تەم و باران نەیاندەوێرا خۆیان لەقەرەی شتێکی دی بدەن. جۆناسان فێر بوو بەرەو فەزاکانی دوور دەریا بڕوات و، لەو دووردەستانە بە مێرووە بەتامەکان خۆی تێر بکات.

ئەوەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئومێدی بوو نەورەسەکانی تری گەلە بیزانن، تەنها خۆی دەیزانی.

ئەم فێری فڕین بووبوو، لەو نرخە گرانەش کە دابووی باکی نەبوو. جۆناسانی نەورەس تێگەیشت کە هۆی تەمەن کورتی، بێزاری و ترس و توڕەییەو، ئەم بەدەرکردنی ئەو بیرۆکانە لە خەیاڵی خۆی توانیی ژیانێکی درێژو شیرین بە چنگ بهێنێت.

* * *

دەمەوشێوان بوو کە چاویان بە جۆناسان کەوت، بە تاقی تەنیاو ئاسوودە لەنێو ئاسمانی دڵبەریدا بەکاوەخۆ دەفڕی.

دوو نەورەس بوون، لەملاولای جۆناسانەوە دەفڕین، دەتوت جریوەی ئەستێرە پاکیزەکانن، چریسکەیان لە شەوبادا

دڵنشین بوو. وەلێ لە هەموو ئەوانە قەشەنگتر کارامەییان بوو لە فڕیندا.
تۆزێک دوور لە جۆناسان، لەسەرخۆو هاوئاهەنگ لەگەڵ باڵەکانی ئەودا نووکی باڵەکانیان دەبزواند.
بێئەوەی لەگەڵیان بئاخفێت؛ خستنییە بۆتەی ئەزموونەوە. ئەزموونێک کە تا ئەو ساتە هیچ نەورەسێک تێیدا سەرنەکەوتبوو. باڵەکانی کردەوە، خێرایی خۆی گۆڕی بۆ میلێک لە کاژێرێکدا، واتە شتێک زیاتر لە وەستان.
دوو مەلە درەخشانەکەی هاوڕێشی وەکو ئەو خێرایی خۆیان کەم کردەوە، ئەوان دەیانزانی بەکاوەخۆ بفڕن.
جۆناسان باڵەکانی خۆی نوشتاندەوە، سووڕایەوەو، بە تەوژمێک کە خێراییەکەی سەدو نەوەد میل بوو لە کاژێرێکدا؛ دەرچوو. دوو مەلەکەی تریش وەکو ئەویان کرد و هاوئاهەنگ پێکەوە بەرەو خوارەوە داکشان. دەتوت دوو تیشکن بەملاولای جۆناسانەوە.
سەرەنجام جۆناسان فڕینەکەی بە سووڕانەوەیەکی ڕاست و لەسەرخۆو درێژخایەن گۆڕی. ئەوانیش بەدەم زەردەخەنەوە سووڕانەوە.
پاشان گەڕایەوە بۆ ئاستی فڕینی خۆی و، دوای کەمێک بێدەنگی وتی: ((زۆر باشە، ئێوە کێن؟))
بە ئاوازێکی سەنگین و هێمنەوە وتیان: ((ئێمە لە گەلەکەی تۆین جۆناسان، هاتووین تا بەرەو شوێنە بڵندترەکانت بەرین، بتگەڕێنینەوە بۆ ماڵە ڕاستەقینەکەی خۆت)).
((من ماڵم نییە، گەلەم نییە، دەرکراوم. ئەوەتا وەک دەبینن ئێستاکە بەسەر کێوبای مەزندا گوزەر دەکەین. هەر ئەوەندەم

لەدەس دێ چەند سەد پێیەکی تر ئەم جەستە پیرەم بەرەو بڵندایی بەرم، زیاتر نا...)).

((بــەڵام لەتواناتدا هەیە جۆناسان، چونکە تۆ قۆناغی فێربوونت دیوە، ئێستاش نۆرەی قۆناغێکی ترە)).

ئەم قسانە وەک تریفەی درەوشانەوەیەک گیانی جۆناسانی گەشاندەوە. ئەوان ڕاست دەکەن، ئەم دەتوانێ بڵندتر بفڕێ و بچێتەوە بۆ ماڵی خۆی.

دوانیگای ئۆخژن بەخشی ئاسمانی کرد، لەو پانتاییە زیوینە ڕاما کە شتی لێوە فێر ببوو. سەرەنجام وتی: ((من ئامادەم)).

جۆناسانی نــەورەس ئەمەی وت و، ئاخێزێکی کرد تا هــاوڕێ لەگەڵ هــەردوو نــەورەســە ئەستێرەئاساکەدا، لە ئاسمانی ئەنگوستەچاودا ون ببێت.

((کەواتە ئەمەیە بەهەشت!)) لە دڵی خۆیدا ئەمەی وت و، سووکەبزەیەکی هاتێ. هەستی کرد لەو ساتانەدا کە بەرەو بەهەشت دەفڕێ، شایستە نییە بیری خۆی بە بەهەشتەوە خەریک بکات.

ئەوە بوو دەمەوئەنگۆر لەگەڵ دوو نەورەسی درەخشاندا لە زەوییەوە تا سەروو هەورەکان هاتبوو، تەماشای کرد جەستەی ئەمیش وەک جەستەی ئـەوان دەدرەوشێتەوە. هەر بەڕاستی هەمان ئەو جۆناسانی نەورەسە لاوە بوو کە هەمیشە لەپشت چاوە ئاڵتوونیەکانیەوە دڵی بۆ ژیان لێی دەدا، بەڵام ڕووخساری گۆڕابوو. جەستەی هەروەکو جەستەی نەورەسەکانی دیکە بوو، وەلێ لە جاران گەلێ باشتر دەفڕی. لە دڵی خۆیدا وتی: ((کەواتە دەتوانم بە تەقەلایەکی کەمتر لە جاران خێراییەکەم بکەمە دوو ئەوەندەی خێرایی باشترین ڕۆژانی مەشقی سەر زەویم)).

پەڕەکانی ڕۆشن و سپی دەدرەوشانەوە، باڵەکانی نەرم و ڕێک و تەبا بوون؛ دەتوت دوو پارچە زیوی بریقەدارن. دڵشادانە ویستی لەگەڵ باڵە نوێکانی خۆیدا ئاشنا بێت، دەستی بە خستنەگەڕی باڵە نوێکانی کرد. لە خێرایی دووسەدو پەنجا میل لە کاژێرێکدا، هەستی کرد لە زۆرترین خێرایی فڕینی ئاسۆیی نزیک بۆتەوە. لە خێرایی دووسەدو حەفتاو سێ میل دا بیری کردەوە؛ تا ئەو ڕادەیەی لە توانایدایە خێرا دەفڕێ و،

کەمێک هەستی بە نائومێدی کرد.
دیارە جەستەی نوێش سنوورێکی هەیە. هەرچەند زۆر خێراتر لە پێشان دەفڕی؛ بەڵام هێشتا هەر سنوورێک لەبەردەمدا بوو کە ڕەتاندنی پێویستی بە هەوڵ و تەقەلایەکی فرە هەبوو. لە دڵی خۆیدا وتی: ((بەڵام لە بەهەشتدا کوا سنوور هەیە ؟!))
هەورەکان ڕەوینەوە، هاوڕێکانی هاواریان کرد:
((جۆناسان، خۆشهاتیت بۆ ئەم وڵاتە)). ئینجا لە ئاوریشمی هەوادا لەچاو ون بوون.
بەسەر دەریاکەوە، بەرەو بەرزاییەکانی کەنار دەفڕی. چەند نەورەسێک لە سەر تاوێرە بەردە گەرمەکان مەشقی فڕینی بەرەوژووریان دەکرد. لە ئاسۆی دووری باکووریشدا چەند نەورەسێکی دی بە ئاسمانەوە بوون. ئاسۆی نوێ، بیری نوێ، پرسیاری نوێ؛ ژمارەی نەورەسان لێرە بۆچ هێندە کەمە؟! بەهەشت دەبێ پڕ لە نەورەس بێت. ئەی من بۆچ هێندە شەکەتم؟ ئەم لەو باوەڕەدا بووکە نەورەسان لە بەهەشتدا هەرگیز ماندوو نابن و خەو ناچێتە چاویان. ناشزانێ ئەمانەی لەکوێ بیستووە.
هێدی هێدی یادگارەکانی ژیانی سەرزەمینی دوور دەکەوتنەوە. بێگومان لەسەر زەوی گەلێ شت فێر ببوو. بەڵام تەمتومانێک بەری چاوی گرتبوو؛ نەیدەهێشت وردودرشتی ئەو ژیانەی بێتەوە یاد. شەڕو ناکۆکی لەسەر وردە خۆراک، دەرکردن لە گەلەو... هەندێ شتی تریش بە خەیاڵیدا گوزەریان دەکرد. هەندێ شتی ئامێتە لە خەیاڵ و ڕاستی.
نەورەسەکانی کەنارەکە بە بێدەنگییەوە هاتن بۆ

پێشوازیلێکردنی و، بەوپەڕی ڕێزەوە لەبەردەمیدا ڕیز بوون. ئنجا هەستی کرد لای ئەمان چەند نرخی هەیە، هەر بەڕاستی ئەمە ماڵی ڕاستەقینەی خۆیەتی. ئای کە ڕۆژێکی مەزن بوو. ڕۆژێک بوو بیری نایەت چۆن خۆری تیا هەڵات.

بۆ دابەزینە سەر ڕۆخ سووڕێکی خوارد، باڵەکانی لێک دا، تا کەمێک لە هەوادا بمێنێتەوە، پاشان کاوەخۆ لەسەر لمەکان نیشتەوە. نەورەسەکانی تریش نیشتنەوە. بەڵام هیچیان باڵیان لێک نەدا.

سەرلەنوێ لە هەوادا سووڕیان خوارد، باڵە درەخشانەکانیان کردەوە، کەوانەی باڵیان گۆڕی تا لەسەر زەوی نیشتنەوە؛ ئینجا وەستان. شێوەی وەستانەکەیان گەلێ جوان بوو. وەلێ جۆناسان لەوە ماندووتر بوو ئەوە فێر بێت. لە کەنار دەریاکە وەستا، بێئەوەی بکەوێتە قسان؛ خەوێکی قووڵ چووە چاوانی.

ڕۆژانی ئایندە جۆناسان تێگەیشت کە دەتوانێ لەم دەڤەرەدا هێندەی ژیانی ڕابردووی شت فێر ببێت. بەڵام بە جۆرێکی دی، لێرە نەورەسەکان وەک ئەم بیریان دەکردەوە. بەلای هەر یەکێکیانەوە گرنگترین شت لەژیاندا گەیشتنە پلەی باڵایی بوو. ئەوەی لە پلەی باڵاییشدا پتر لە هەر شتێکی دی هەڵوەدای بوون؛ فڕین بوو. ئەمانە کۆمەڵێک باڵندەی شکۆمەند بوون. ڕۆژی چەندان کاژێر سەرگەرمی مەشقی فڕین و فێربوونی بڕینی پانتاییە نوێکانی ئاسمان دەبوون.

بۆ ماوەیەکی درێژ جۆناسان ئەو دونیایەی لەبیر چووەوە کە لێوەی هاتبوو، ئەو دونیایەی تیایدا گەلە لە ئاست فڕیندا چاوانی خۆی دەنووقاندو، باڵەکانیشی تەنها بۆ وەچنگهێنانی

خۆراک و ململانێ لەپێناوی خۆراکدا بەکار دەهێنا.

هەموو ئەمانە لە بیری هەڵاتبوون، جار نا جارێک نەبێ بۆ تاوێک دەهاتنەوە یادی.

بەیانییەکیان. وەختێ لای مامۆستاکەی سەرگەرمی فێربوون بوو، هەر ئەوەندە دوای مەشقی سووڕانەوەی ناگەهان، بە باڵی چەماوەو سەرێکی ئاسودەوە لە کەنار نیشتەوە؛ جارانی بیر کەوتەوە.

لەسەرخۆ پرسیی: ((سۆلیڤان، ئەوانی تر لەکوێن؟)) لەبەرئەوەی شێوازێکی تری ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەبری قیژەقیژو وردەبەرد تێگرتن فێر ببوو، بە ئاسودەییەوە پرسیی: ((بۆچی ژمارەی نەورەسان لێرە کەمە؟ لە کاتێکدا ئەو شوێنەی منی لێبووم)).

سۆلیڤان قسەکەی پێ بڕی‌و بەسەر ڕاوەشاندنەوە وتی: ((هەزاران هەزار نەورەسی لێبوو، دەزانم، بەڵام تاقە وەڵاَمی من بۆ تۆ جۆناسان ئەوەیە کە لەناو هەزاران باڵندەدا یەکێکی وەک تۆی تیا هەڵدەکەوێت. زۆربەمان گەشتێکی کاوەخۆو درێـژمـان ئەنجام داوە ئینجا گەیشتووینەتە ئێرە، لەو گەشتەماندا لە دونیایەکەوە بۆ دونیایەکی دی پەلمان کوتاوە کە زۆر لەیەک چوون. لەو گەشتەدا هەموو بیرەوەریەکانمان سەبارەت بەو دونیایە فەرامۆش کردووە کە لەوەوبەر لێوەی هاتووین و نەشمانزانیوە بۆ کوێ مل دەنێین. ژیان لامان تەنها ئەو ساتانە بووە کە تیایدا ژیاوین. تۆ قەت بیرت لەوە کردۆتەوە کە بەرلەوەی پەی بەو حەقیقەتە بەرین کە لە ژیاندا شتی بەبەهاتر لە خواردن و، شەڕو ناکۆکی و، دەسەڵاتداری لەنێو گەلەدا هەیە؛ ئاخۆ چەند جۆر ژیانمان بەسەر بردبێت؟

هەزار ژیان، جۆن، دە هەزار، بگرە سەد هەزار ژیانی ترمان بەسەر بردووە بەرلەوەی ئەم بیرو باوەڕە لە ڕۆحماندا شکۆفە بکات کە ئامانجی ئێمە لە ژیاندا گەیشتنە بە پلەی بالآیی و، پێویستە لە هەموو ئامانجەکانی دی بە بەرزتری بزانین. ئەوەتانێ وەک دەبینیت ئێمە جیهانی ئایندەمان بە یاریدەی ئەو زانیاریانە هەڵدەبژێرین کە لەم جیهانەوە فێریان بووین، خۆ ئەگەر هیچ فێر نەبیت، ئەوا جیهانی ئایندەشت وێنەیەکی تری ئەم جیهانە دەبێ و، دووچاری هەمان ئەو کۆت و پێوەندو لەمپەرو سنوورانە دەبیتەوە کە پێویستە بیانبەزێنیت )).

باڵەکانی کردەوە و سوورێکی خوارد تا ڕووبەڕووی بایەکە بێتەوە، ئەوجا وتی: ((بەڵام تۆ جۆناسان، لە تاقە ژیانێکدا فێری زۆر شت بوویت، بۆیە پێویستت بەو هەزاران ژیانە نەبووە تا بیانبڕیت بۆ گەیشتنەجێ)).

هەمدیسان جەستەی خۆیان دایەوە دەم باو کەوتنەوە مەشق. سووڕانەوەی بازنەیی، لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئاسان نەبوو، چونکە جۆناسان هاوکات لەگەڵ ئەم سووڕانەوەیەدا دەبووایە باڵی هەڵبگێڕێتەوە تا باڵەکانی خۆی لەگەڵ مامۆستاکەیدا هاوئاهەنگ بکات.

سۆلیڤان وتی: ((وەرە با سەرلەنوێ هەوڵ بدەینەوە)). چەند جارێک ئەم قسەیەی دووپات کردەوە

((وەرە با سەرلەنوێ هەوڵ بدەینەوە)). تا دواجار وتی: ((زۆر چاکە زۆر جوانە!)).

ئینجا دەستیان بە مەشقی بێپایانی سووڕانەوە بازنەییەکان کرد.

* * *

ڕۆژێکیان دەمەوعەسر ئەو باڵندانەی کە ئێوارەفڕینیان نەبوو، لەسەر لمەکە لای یەکترەوە وەستا بوون و ڕامابوون. جۆناسان پڕکێشیی خۆی خستە گەڕو بەرەو لای ئەو نەورەسە گەورەیە ملی نا کە دەیانوت بەمزووانە ئەم جیهانە جێدەهێڵێت و بۆ ئەوپەڕی جیهان دەچێت.

بە تۆزێک شڵەژانەوە وتی: ((چیانگ)). نەورەسە گەورەکە بە میهرەبانییەوە سەیرێکی کردو وتی: ((بەڵێ کوڕم)).

ساڵانی ڕابردووی تەمەنی؛ ئەم نەورەسەی کەنەفت و پیر نەکردبوو، بەڵکو هێزی پێ بەخشیبوو، لە نەورەسەکانی تری گەلە تیژفڕتر بوو. هونەری وەهای دەزانی کە ئەوانی تر تازە هەوڵیان دەدا فێری ببن.

((چیانگ ئەم جیهانە بەهەشت نییە، وانییە؟))

نەورەسە گەورەکە لەبەر تریفەی مانگدا بزەی هاتێ، وتی: ((جۆناسانی نەورەس، دیسان دەتەوێ فێر ببیت؟))

((باشە، ئەی لێرە بەدواوە چی دەبێت؟ بۆ کوێ دەچین؟ ئایا بەهەشت لە شوێنێکی دیکەیە؟))



((نەء، جۆناسان، شوێنی لەو جۆرە بوونی نییە. بەهەشت لە کات و شوێندا نییە. بەهەشت گەیشتنە بە پلەی باڵایی و بەرکەماڵی)).

ساتێک بێدەنگ بوو، ئینجا وتی: ((تۆ زۆر تیژفڕیت، وانییە؟)).

جۆناسان بەدەستەوسانەوە وتی: ((من.. من حەزم لە تیژفڕینە )). کە زانیی نەورەسە گەورەکە لە مەرامی گەیشتووە، شانازیی بە خۆیەوە کرد.

((کەی خێرایی خۆت گەیاندە پلەی بەرکەماڵی؛ دەبینیت

بەهەشت لەلاتەوەیە، جۆناسان. ئەمەش مانای فڕین بە خێرایی هـەزار میل، یان ملیۆنێک میل لە کاژێرێکدا، یان فڕین بە خێرایی تیشک ناگەیەنێ، چونکە هەر ژمارەیەک لەم ژمارانە سنووریک دیاری دەکات. لە کاتێکدا باڵاییو بەرکەماڵی بێ سنوورە. کوڕم، خێرایی واتە لێرەش بیت و، لەوێش بیت)).
لەپڕێکدا چیانگ لەچاو ون بوو، پاشان لە دووریی پەنجا پێوە لای ڕۆخەکەوە دەرکەوتەوە، ئەمەی لە چاوتروکانێکدا ئەنجام دا. ئینجا دووبارە لەچاو ون بۆوە و لە ماوەی هەزار یەکی چرکەیەکدا لە پەنا جۆناسانەوە وەستایەوە و وتی: ((ئەمەش شتێکی خۆشە )).

جۆناسان سـەری سـووڕمـا، بیری چـووەوە دەربـارەی بەهەشت پرسیار بکات و وتی: ((چۆن ئەمە دەکەیت؟ هەست بە چی دەکەیت؟ تا چەند دەتوانی دوور بکەویتەوە؟))

نـەورەسـە گـەورەکـە وتـی: ((بـۆ هـەر شوێن و زەمانێک بتەوێ؛ دەتوانیت بڕۆیت، من بیرم لە هەر شوێن و زەمانێک کردبێتەوە بۆی ڕۆیشتووم)).

تەماشایەکی دەریاکەی کردو وتی:((ئەوانەی لە ترسی سەختیی ڕێگا؛ گەیشتن بە بەرکەماڵی بە کارێکی چەوت دەزانن؛ ناگەنە هیچ کوێ. بەڵام ئەوانەی بە ئومێدی گەیشتن بە بەرکەماڵی گوێ بە سەختیی ڕێگا نادەن، دەگەنە هەر کوێیەک بیانەوێت. جۆناسان ئەوەت لەیاد نەچێت کە بەهەشت شوێن یان زەمان نییە. چونکە شوێن و زەمان دروشمی بێمانان.، بەهەشت)).

((دەتوانیت منیش فێر بکەیت وەکو تۆ بفڕم؟))

جۆناسانی نەورەس لە حەژمەتی پەیبردن بە نهێنییەکی

دیکە تەواوی بەدەنی دەلەرزی.
((ئـەی بۆ نـا، ئەگەر لە کانگای دڵـەوە حـەز بکەیت فێر ببیت.)).
((لە کانگای دڵەوە تامەزرۆی فێر بوونم. کەی دەست پێ بکەین؟))
((حەز دەکەیت هەر ئێستا دەست پێ دەکەین)).
جۆناسان وتی: ((دەمەوێ ئەو جۆرە فڕینە فێر بم)).
نووریێکی نامۆ لە چاوەکانیدا درەوشایەوە ((پێم بڵێ.. دەبێ چی بکەم؟))
چیانگ بەهێمنی دەدواو بـەوردی چاوی بڕیبووە باڵندە لاوەکە.
((بۆ هەر شوێنێک بتەوێ بەهەمان خێرایی بیرکردنەوەت لەو شوێنە بفڕیت، سەرەتا دەبێ وا بهێنیتە پێش چاوت کە گەیشتوویتەتە ئەو شوێنە)).
هەروەکو چیانگ وتبووی، هونەری ئەو کارە لەوەدا بوو کە جۆناسان لە کۆت و پێوەندی جەستەی خۆی ڕها بێت، ئەو جەستەیەی کە درێژیی باڵەکانی نەوەدو سێ سانتیمەتر بوو، لە کاتی فڕیندا سنوورەکانی دەریا زیاتری تێنەدەپەڕاند. ئەم هونەرە پەیبردن بوو بەوەی کە سروشتی ڕاستەقینەی وەکو ژمارەیەکی نەنووسراوە، کەی بیەوێ دەتوانێ لە هەر شوێن و زەمانێکدا کە مەبەستێتی دەر بکەوێ.
پەیبردن بەم حەقیقەتە کارێکی قووڵی لە جۆناسان کرد. ڕۆژ دوای ڕۆژ لە سپێدەی سەحەرانەوە تا شەو درەنگان سەرگەرمی ئـەم مەشقە بـوو، بـەڵام هەوڵەکانی بێهوودە بوون.

چیانگ چەندها جار دووپاتی کردەوە: ((بڕواکردن بەو حەقیقەتە لەبیر خۆت بەرەوە! بۆ ئەوەی بفڕیت پێویستیت بە پەیبردن بە جۆری فڕینەکەیە. ئەمەیش هەروەکو ئەوی دی وایە.. دەی سەرلەنوێ هەوڵ بدەرەوە...)).
سەرەنجام ڕۆژێکیان جۆناسان کە لای کەنارەکەوە وەستابوو، چاوەکانی نووقاندبوو. بیرو هزری خۆی چڕ کردبۆوە. ناگەهان لە کرۆکی قسەکانی چیانگ گەیشت ((کەواتی ڕاستیەکەی ئەوەیە کە من نەورەسێکی باڵاو ئازادم!)) هەستی شکۆمەندی سەراپا گیانی تەنییەوە.
ناکاو گوێی لە دەنگی چیانگ بوو هاواری کرد:
((زۆر چاکە!))
جۆناسان چاوی هەڵهێنا. خۆیو نەورەسە گەورەکە، هەردووکیان پێکەوە لە گوێ دەریایەکی تەواو جیاواز بوون. درەختان سەریان بۆ ناو ئاوەکە شۆڕ کردبۆوە. دوو خۆری زەرد لە ژوور سەریانەوە تۆزی ئاڵتوونیان بەو نێوەدا دەپرژاند، چیانگ وتی: ((دواجار لە بیرۆکەکە گەیشتیت، بەڵام بۆ زاڵبوون بەسەر خودی خۆتدا؛ هێشتا ماوتە..)).
جۆناسان واقی وڕما بوو ((ئێمە لەکوێین؟))
نەورەسە گەورەکە بێئەوەی بەم سەرزەمینە تازەیە سەرسام بێت وتی: ((ئێمە لە هەسارەیەکی دیکەین، هەسارەیەک کە ئاسمانەکەی سەوزەو دوو خۆری هەیە)).
جۆناسان بە شادییەوە هاواری کرد: ((سەرکەوتنم بەدەست هێنا)). لەوەتەی زەوییان بەجێ هێشتبوو تا ئەو ساتە؛ ئەمە یەکەم هاواری شادمانی بوو لە زاری بێتە دەرێ.
چیانگ وتی: ((بەڵێ، بێگومان سەرکەوتنت بەدەست

هێنا جۆن. هەر کاتێک زانیت چیت دەوێ و چی دەکەیت؛ سەرکەوتن لەسەر ڕێت چاوەڕێت دەکات. دەربارەی بەسەر خۆزاڵبوونیشدا..)).
وەختێ کە گەڕانەوە هەوا تاریک ببوو. نەورەسەکانی دی بە چاوە ئاڵتوونیەکانیانەوە؛ بەڕێزەوە تەماشای جۆناسانیان دەکرد. ئەم نەورەسانە جۆناسانیان بینی چۆن لەو شوێنەدا کە پێشتر لێی بوو؛ لەچاو ون بوو.
کاتێ نەورەسەکان پیرۆزباییان لێ کرد؛ تاوێک وەستاو ئنجا وتی: ((من تازە پێم خستۆتە ئەم دونیایەی ئێوەوە! من هێشتا لە سەرەتادام و، هاتووم تا لە ئێوەوە شت فێر بم!))
سۆلیڤان کە لە نزیکیانەوە وەستابوو وتی: ((من گومانم لەم قسەیەت هەیە جۆناسان، چونکە دە هەزارساڵیش دەبێ نەورەسێکم نەدیوە هێندەی تۆ شەیدای فێربوون بێ)).
خامۆشی باڵی بەسەر پۆلە نەورەسدا کێشاو، جۆناسان هەستی بە تۆزێک شەرم کرد.
چیانگ وتی: ((گەر بتەوێ دەتوانیت پێش زەمەن بکەویت، تاکو بتوانیت لە ڕابردووەوە بۆ ئایندەو بەپێچەوانەشەوە بفڕیت. ئەوکات ئامادەی دژوارترین و بەهێزترین قۆناغ دەبیت. دەتوانیت بەرەو بەرزاییەکان لە شەقەی باڵ بدەیت و لە مانای عیشق و میهرەبانی تێبگەیت)).
مانگێک تێپەڕی، یان زەمەنێک کە دەتوت مانگێکە. لەم ماوەیەدا جۆناسان زۆر شت فێر بوو. بەردەوام هەر مەشقێکی نوێ دەهاتە گۆڕێ، زۆر بەخێرایی فێری دەبوو. ئەم قوتابییە تایبەتییەی نەورەسی مەزن وەک ماشێنێکی ئەلیکترۆنیی پەڕوباڵدار هەڵوەدای بیرو ئەندێشەی نوێ بوو.



ئاخرییەکەی ڕۆژێکیان چیانگ دیار نەما. بەر لە دیار نەمانی بە هێمنی لەگەڵ هەموویاندا دوا.

ئامۆژگاریی کردن کە هەرگیز ساتێک چییە لە ژیانیان بەفیڕۆی نەدەن و، بەردەوام خەریکی فێربوون و مەشقی دژوار بن و، تەقەلا بدەن زیاتر پەی بە ڕیشەی پەنهانی بالآییو بەرکەماڵی بەرن.

چیانگ وەختێ دەدوا، باڵەکانی درەخشان و درەخشانتر دەبوونەوە سەرەنجام بەڕادەیەک تابان بوون کە لە توانای

هیچ نەورەسێکدا نەبوو چاویان تێ ببڕێ.

چیانگ دواجار ڕووی دەمی کردە جۆناسان و وتی:

((جۆن، هەمیشە عاشق بە)).

ئیدی ئەمە دوا وشە بوون کە لە زاری هاتنە دەر.

نەورەسەکان کاتێ هێزی بیناییان هاتەوە بەر، چیانگ لەچاو ون ببوو.

بەمجۆرە ڕۆژان دەهاتن و دەچوون. جۆناسان هەستی دەکرد ناو بە ناو یادی ئەو سەرزەمینە دەکاتەوە کە لێوەی هاتبوو. ئەگەر لەوێ دە یەک، یان تەنها سەد یەکی ئەوەی ئێرەی دەزانـی، ژیانی مانایەکی قووڵتری دەبـوو! لەسەر لمەکە وەستاو تێفکری ((ئایا ئێستا لەوێ نەورەسێک نییە بۆ ڕەهایی لە کۆت و پێوەند تەقەلا بدات و، مانای فڕین قووڵتر تێبگات لەوەی بە تەنها گەشتێک بێت بۆ وەچنگهێنانی وردەنانی ناو بەلەمە سەوڵدارەکان. ڕەنگە نەورەسێکی وا هەبووبێت و لەسەر ئـەوەی کە بەرامبەر گەلە حەقیقەتی وتووە؛ دەرکرابێت)).

جۆناسان چەندێ پتر لەسەر وانەکانی تێگەیشتنی گەوهەری میهرەبانی بەردەوام دەبوو، پتر بۆ ناسینی گەوهەری عیشق دەکۆشا؛ جۆش و خرۆشی گەڕانەوە بۆ سەرزەمینەکەی خۆی زیاتر لە ناخیدا زمانەی دەکێشا، چونکە گەرچی هەموو ڕابردووی بە تەنیایی بەسەر بردووە، بەڵام وێڕای ئەوەش جۆناسان بۆیە دروست بووە تا ببێتە مامۆستا. ئەمە ڕێی شکۆفەی عیشقی بوو؛ ئەو حەقیقەتەی کە پەی پێ بردووە بەو نەورەسانە ڕابگەیەنێ کە تامەزرۆی هەلێکن بۆ زانینی حەقیقەت.

سۆلیڤان کە لە ـــ فڕینی تیژ وەک بیر ـــ دا کارامە بوو یارمەتی ئەوانی تری دەدا تا فێر بن؛ بەم بیرۆکەیەی جۆناسان نیگەران بوو. بۆیە پێی وت:

((جۆن، تۆ لە گەلە دەرکراویت. ئیدی چۆن لەو بڕوایەدایت نەورەسەکان گوێت بۆ شل دەکەن؟! تۆ ئەو پەندەت بیستووە کە دەڵێت: (ئەو باڵندەیەی بەرزتر بفڕێ؛ دوورتر دەبینێ)، ئەمە پەندێکی ڕاستە. باڵندەکانی زێدی تۆ لە سەر زەمین وەستاون و سەریان بۆ خوارەوە شۆڕ کردۆتەوە و بەردەوام لەناو خۆیاندا شەڕو شۆڕیانە. ئەوان هەزاران میل لە بەهەشتەوە دوورن. تۆش دەتەوێ لەوێوە بەهەشت بەدی بکەن! جۆن ئەوانە ناتوانن تەنانەت نووکی باڵی خۆشیان بەدی بکەن! لێرە بمێنەرەوە. یارمەتی ئەو نەورەسانە بدە کە تازە هاتوونەتە ئێرە، ئەو نەورەسانەی هیچ نەبێ لە قسەکانت دەگەن)).

ساتێک ڕاماو پاشان وتی: ((گەر چیانگ بۆ دونیا دێرینەکانی خۆی بگەڕابایەتەوە؛ چ دەبوو؟ تۆ ئێستا لەکوێ دەبوویت؟)).

جۆناسان مایەوەو لەگەڵ ئەو باڵندانەدا دەستی بە کار کرد کە تازە گەیشتبوون. ئەو باڵندانەی کە لە فێربوونی وانەکانیاندا گەلێ زیرەک و وریا بوون، بەڵام ئەوەندەی نەبرد هەستە دێرینەکەی سەری هەڵدایەوەو تێفکری؛ هەرچۆنێک بێت یەک دوو نەورەس لەسەر زەوی دەبینێتەوە کە ئامادەگیی فێربوونیان لا هەبێت. هەر لەو ڕۆژەوە کە تیایدا دەرکرا؛ گەر چیانگ فریایبکەوتایەو پەلی بگرتایە، ئێستا زۆر زیاتری دەزانی.

سەرەنجام وتی: ((سۆلیڤان، دەبێ بگەڕێمەوە، قوتابییەکانی

تۆ باشن و دواتر ئەوان دەتوانن لە فێرکردنی باڵندەکانی تردا یارمەتیت بدەن)).

سۆلیڤان ئاخێکی هەڵکێشا، بەڵام ئەمجارەیان مشتومڕی لەگەڵ نەکرد. تەنها وتی: ((گەر ئێرە جێبهێڵیت زۆرت بیر دەکەم))..

جۆناسان بە سەرزەنشتیەوە وتی:

((سۆلی، چۆن وا دەڵێی؟ ئەی تێکۆشانی ڕۆژانەی ئێمە بۆ چییە؟ ئەگەر خۆشەویستیی نێوان ئێمە بەسترابێتەوە بە شتی وەک کات و شوێنەوە؛ کەواتە وەختێ بەسەر کات و شوێندا زاڵ بووین؛ هاوڕێیەتیمان لەنێو دەچێت؟! وەلێ زاڵبوون بەسەر شوێندا، واتە کە ئێمە (ئێرە ) ڕەها بکەین. زاڵبوون بەسەر کاتیشدا واتە ڕەهاکردنی (ئێستا). تۆ لەو بڕوایەدا نیت کە دەشێ ئێمە جارجار لەنێوان ئێرەو ئێستادا یەکتری ببینین؟))

سۆلیڤانی نـەورەس، بێئەوەی بیەوێت بزەیەکی هاتێ. بە میهرەبانییەوە وتی: ((تۆ ئەی باڵندە دێوانەکە، ئەگەر لەسەر ڕووی زەوی تاقە نەورەسێک هەبێ بتوانێ نەورەسێکی دی فێر بکات چۆن لە دووریی هەزار میلەوە ببینێ، بێگومان ئەو نەورەسە هەر جۆناسانە)).

ئینجا چـاوی بڕییە لمەکان و وتـی: ((ماڵئاوا جـۆن، ئەی هاوڕێکەم)).

((ماڵئاوا سۆلی، بەئومێدی دیدار)).

لەم کاتەدا وێنەی گەلە نەورەسی کەنار دەریـا هاتە پێش چاوی. جۆناسانی دنیادیدە هەستی دەکرد مشتێک پەڕو ئێسقان نییە، بەڵکو نموونەیەکی کاملی ئازادیو فڕینی بێ سنورە.

* * *

فلیچەرلیندی نەورەس هێشتا لە هەرەتی لاویدا بوو، بەڵام دەیزانی کە تاکو ئێستا گەلە لەگەڵ هیچ باڵندەیەکدا بەو دڵڕەقیو توندوتیژییە ڕەفتاری نەکردووە وەکو بەرامبەر ئەم کردیان. بە تووڕەییەوە لە دڵی خۆیدا وتی: ((هەرچیەکم پێ دەڵێن با بیڵێن)) بەدەم فڕینەوە بەرەو گاشەبەردە دوورەکان، بەرچاوی لێڵ بوو ((فڕین زۆر لەوە زیاترە کە بە تەنها باڵ بەیەکدادان و ئەملاولاکردن بێ. تەنانەت...تەنانەت مێشوولەیەکیش ئەوەی پێ دەکرێ! هەر ئەوەندە بەدەوری گەورەی نەورەساندا خولانەوەیەکی لارم ئەنجام دا، ئەویش هەر بۆ گاڵتە، کەچی بوو بەهۆی ئەوەی لە گەلە دەربکرێم! ئەمانە کوێرن؟ نابینان؟ بیر لەوە ناکەنەوە چەند شکۆمەندییە گەر هەموومان فێری فڕینی ڕاستەقینە بین؟!))

((بەلامەوە گرنگ نییە بیر لە چی دەکەنەوە. فێریان دەکەم فڕین یانی چی. ئەگەر ئەوان خوازیاری ئەو جۆرە ژیانەن ئەوا من دەژیم. دەبێ وایان لێ بکەم پەشیمان ببنەوە..)).

گوێی لە دەنگێک بوو، وەک ئەوەی لە ناخیەوە سەری هەڵدابێ، دەنگێکی ناسک و هێمن بوو، بەڵام مووچڕکێکی بە لەشیدا هێناو بووە هۆی ئەوەی لە هەوادا لەترێک بدات.

((فلیچەری نەورەس! ئەوەندە لەگەڵیاندا دڵڕەق مەبە. نەورەسەکانی دی بە دەرکردنی تۆ تەنها ئازاری خۆیان داوەو، ڕۆژێک دێ بەو کردەوەیەی خۆیاندا بچنەوە، ئەوانیش ئەوە ببینن کە ئێستا تۆ دەیبینیت. لەگەڵیاندا سنگفراوان بەو یارمەتییان بدە تا تێبگەن)).

لەولای نووکی باڵی ڕاستیەوە، لە دوورییەکی کەمەوە، تابانترین نەورەسی سپیی دونیا دەفڕی. بێئەوەی خۆی

ماندوو بکات سووک دەفڕی. بێئەوەی باڵێک لە باڵەکانی بجووڵێنێ و، بەهەمان خێرایی فڕینی فیلچەر کە لەوە دەچوو دوا خێرایی بێت.

بۆ تاوێک باڵندە لاوەکە ئاشیفتەو سەرسام بوو.

((چـــی ڕوودەدا؟ شـێت بـــووم؟ یـــان مـــردووم؟ ئەمە چییە؟!!))

دەنگە هێمنەکە بوو بەڕاست و ئارامانە پرسیی:

((فلیچەرلیندی نەورەس! ئایا حەز دەکەیت بگەیتە بڵندایی‌یەک لە فڕیندا کە تیایدا گەلە ببەخشیو، فێر ببیت و، ڕۆژێک بگەڕێیتەوە لایان و یارمەتییان بدەیت؟))

فلیچەر بیری کردەوە گەرچی گەلە دڵیان بریندار کردووەو هەستیان ڕوشاندووە، بەڵام بەرامبەر ئەم پێشنیازە دڵڕفێنە ناتوانێ درۆ بکات. بۆیە بە نەرمییەوە وتی: ((بەڵێ حەز دەکەم)).

باڵندە تابانەکە بە دەنگێکی پڕ لە میهرەبانییەوە وتی:

((کەواتە وەرە پێشەوە فلیچەر، با لە فڕینی نزمەوە دەست پێ بکەین)).

جۆناسان کاوەخۆ بەسەر گاشەبەردە دوورەکاندا دەسووڕایەوەو ڕادەما. لە دڵی خۆیدا وتی: ((ئەم نەورەسە بچکۆلە شڵەژاوە قوتابییەکی نموونەییە بۆ فڕین. لە هەوادا بەهێزو سووک و تیژفڕ بوو، بەڵام لەوانە گرنگتر ئەو ئەنگێزە قووڵەی ناخێتی کە بۆ فێربوونی فڕین هانی دەدا)).

ئەوەتانێ بە سیمایەکی خۆڵەمێشیی نادیارەوە وەک زریان توند وروژمی هێنا. ئینجا بەخێرایی سەدو پەنجا میل لە کاژێرێکدا بەلای مامۆستاکەیدا تێپەڕی. ئینجا بۆ وەرچەرخانێکی ئارام و ستوونی هەوڵێکی تری دا، دەستی بە ژماردن کرد تا شانزە، بە دەنگی بەرز دەیژمارد.

((هەشت.. نۆ.. دە.. تەماشاکە جۆناسان، خەریکم لەگەڵ بادا پێشبڕکێ دەکەم، یانزە... من دەمەوێ فێری وەستانە جوانەکانی تۆو خێراییەکانی تۆ بم.. دوانزە.. بەڵام ئاخ... نەفرەت... من ناتوانم... سیانزە.. ئەم سێ ژمارەیە... چواردە..ئاخخخخ...)).

فلیچەر لە داخی ئەوەی هەوڵەکەی شکستی هێنا؛ توڕە بوو، هەستی کرد دواکەوتووە، بۆیە بەدەم هاوارەوە بەتوندی لە وەرچەرخانێکی پێچەوانەدا لەترێکی داو، سەرەنجام بەدەم هەناسەبڕکێوە سەد پێ لە خوار مامۆستاکەیەوە خۆی گرتەوە.

((جۆناسان، پێدەچێ تۆ وەختی خۆت لەگەڵ مندا بەفیڕۆ بدەی! من زیاد لەپێویست گێژم! زیاد لەپێویست دەبەنگم! هەر لە کۆشش و تەقەللادام؛ کەچی ناگەمە مراد !))

جۆناسانی نەورەس لە بەرزاییەکەوە تەماشای کردو سەری ڕاوەشاندو وتی: ((تا ئاوەها بە گرژییەوە هەڵمەت بۆ سەرەوە بەریت، بێگومان ناتوانیت بگەیتە مراد. فلیچەر تۆ لە سەرەتای فڕیندا چل میلت لە کاژێرێکدا بەفیڕۆ دا؟! دەبێ لەسەرخۆ ئەو کارە ئەنجام بدەیت ڕێک و قایم بە؛ بەڵام لەسەرخۆت بە، ئەمەت بیر نەچێ!))

خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی نەورەسە لاوەکەی لێیە.

((ئێستا وەرە با پێکەوە هەوڵ بدەین. تەماشای شاڵاوبردن بۆ سەرەوە بکە. سەرەتایەکی ئاسان و نەرم)).

لە ماوەی سێ مانگدا جۆناسان بووە مامۆستای شەش قوتابی، کە هەموویان لە گەلە دەرکرابوون؛ چونکە سەوداسەری ئەم بیرۆکە سەیرە نوێیەی فڕین بوون: ((فڕین لەپێناوی لەزەتی فڕیندا)) بەلای ئەمانەوە بەرزفڕین ئاسانتر بوو لە تێگەیشتنی هۆی پەنهانی پشت ئەو فڕینە.

((هەر یەکێک لە ئێمە وێنەیەکین لە نەورەسی مەزن، وێنەیەک لە بێ سنووری و ئازادی))

جۆناسان لە ڕۆخ دەریا ئەم قسانەی بۆ دەکردن.

((فڕینی باشیش هەنگاوێکە بۆ تێگەیشتن لە سروشتی ڕاستەقینەمان. دەبێ تەواوی ئەو شتانە لەنێوبەرین کە دەست و پێمان کۆت دەکەن. ئەمەش ئامانجی ئێمەیە لە مەشقی تیژفڕین و کاوەخۆفڕین و فەزابڕین)).

خەوێکی قووڵ چووە چاوی قوتابییەکان، چونکە تەواوی ئەو ڕۆژە بە ئاسمانەوە بوون، شەیدای مەشق بوون، چون خێراو خرۆشێنەر بوو. فێربوونی هەر وانەیەکی نوێ لە تینوێتیی دەشکاندن، بەڵام شتاقیان، تەنانەت فلیچەرلیندی نەورەسیش،

نەگەیشتبوونە پلەی فڕین بەخێرایی بیر، کە بە باوەڕی ئەوان فڕینی ڕاستەقینەیە. جۆناسان هەموو جارێ دووپاتی دەکردەوە: ((تەواوی جەستەتان؛ لەم نووکی باڵەوە تا ئەو نووکی باڵتان، بریتیە لە بیرتان کە دەتوانن لە شێوەیەکدا بیبینن. کەی زنجیرەکانی بیرتان پساند، زنجیرەکانی جەستەشتان دەپسێ)).

بەڵام وێڕای ئەوەی جۆناسان پەنای بۆ پتر لە وەسیلەیەک دەبرد بۆ دەربڕینی بیروڕاکانی، کەچی بەلای نەورەسەکانی ترەوە وتەکانی لە ئەفسانەیەکی شیرین دەچوون و، هەندێکجار لە کاتی قسەکانی جۆناساندا: ئەوان خەو دەیبردنەوە.

دوای مانگێک جۆناسان وتی: ((وەختی گەڕانەوە بۆ ناو گەلە هاتووە)).

هنری کالڤینی نەورەس وتی: ((ئێمە ئامادە نین! قبووڵمان ناکەنەوە! ئێمە دەرکراوین! ناچار نین بۆ شوێنێک بڕۆین تیایدا پێشوازیمان لێ نەکەن. وانییە؟))

جۆناسان وەڵامی دایەوە: ((ئێمە ئازادین لەوەدا بۆ هەرکوێییەک بچین و، چۆنمان بوێت ئاوەها بین)).

ئینجا لەسەر لمەکەوە بەرەوخۆرئاوا، بەرەو سەرزەمینی گەلە لە شەقەی باڵی دا. قوتابییەکانی تۆزێک شڵەژان، چونکە یاسای گەلە دەڵێت ئەوەی کە دەرکرا بۆی نییە هەرگیز بگەڕێتەوە. دە هەزار ساڵیشە ئەم یاسایە نەشکێنراوە.

یاسا دەیوت: بمێننەوە.

جۆناسان دەیوت: بڕۆن.

جۆناسان نزیکەی میلێک لەو ناوە دوور کەوتبۆوە. ئەگەر ئەمان بەمجۆرە دەستەوئەژنۆ دابنیشن، ئەوەندە نابات تەنها خۆی دەگاتە لای گەلەی شەڕانی.

فیلچەر بێدەنگییەکەی شکاندو وتی: ((باشە، مادامەکی ئێمە خۆمان بە بەشێک لە گەلە نازانین، ناچار نین گوێڕایەڵی یاساکانیشی بین. بەڵام لە هەموو بارێکدا وا چاکترە ئێمەش لەگەڵیدا بین ، تاکو ئەگەر شەڕێک ڕوویدا بتوانین یارمەتیی بدەین)).

بەمجۆرە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە هەشت نەورەس بە دوو دەستە، کە دەتوت دوو پارچەی ئەڵماسێکن، هاو باڵی یەکدی لە خۆرئاوادا لە شەقەی باڵیان دا، خێراییان سەدو سی و پێنج میل بوو لە کاژێرێکدا. هەموو پێکەوە گەیشتنە شوورای کەناری گەلە. جۆناسان لە پێشەوە بوو.

فلیچەری چالاکیش لای باڵی ڕاستیەوە، هنری کالڤین کە دلاوەرانـە دەکۆشا لای باڵی چەپییەوە بوو. ئینجا هەموو بەهێمنی بـەلای ڕاستدا وەرچـەرخـان. دەتـوت باڵندەیەکن دادەبـەزێ... وەردەچەرخێ و... دادەبەزێتەوە. (با) قامچیی لێیان دەدا.

پەیدابوونی ئەم پۆلە نەورەسە تازەیە لە ئاسمانی گەلەدا چون خەنجەرێکی گەورە هەراوزەنای ژیانی نەورەسانی لێک ترازاندو هەشت هەزار چاو بێ پێڵوونان بە سەرسامییەوە ڕوانییانە ئەو نەورەسانە.

تاکەتاکە هەر یەکێک لە هەشت باڵندەکە بەتوندی و لە وەرچەرخانێکی تەواودا، بەرەوسەروو ورژمیان بردو لەم سوڕانەوەیەیاندا خێرایی خۆیان کەم کردەوە و بەهێوری لەسەر لمەکە نیشتنەوە، ئینجا هەروەکو ڕۆژانی دی جۆناسانی نەورەس سەبارەت بە فڕینەکەیان دەستی بە ڕەخنەگرتن کرد.

بە تەوسێکەوە وتی: ((سەرەتا هەمووتان لە نیشتنەوەدا کەمێک خاو بوون..)).

وەک پریشکی ئاگر ژاوەژاو کەوتە نێو گەلەوە.

((ئەمانە ئەو باڵندانە نین کە لە گەلە دەرکران؟! ئەوەتانێ گەڕاونەتەوە! بەڵام ئەمە.. ئەمە ئەقڵ نایبڕێ)).

پێشبینییەکانی فلیچەر لەمەڕ شەڕەوە؛ لەنێو سەرسامی گەلەدا ون بوو.

چەند نەورەسێکی لاوتر وتیان: ((زۆر چاکە، گریمان ئەمانە دەرکراون، ئەی لەکوێ ئەم فڕینە فێربوون؟!))

کاژێرێکی خایاند تا پەیامی ((گەورەی گەلە)) بە نێویاندا بڵاو بۆوە: ((ئەفەرۆزیان بکەن. هەر نەورەسێک لەگەڵ نەورەسێکی دەرکراودا بئاخڤێت، ئەویش دەچێتە ڕیزی دەرکراوانەوە. هەر نەورەسێک بایەخ بە نەورەسێکی دەرکراو بدات، مانای وایە یاسای گەلەی شکاندووە)).

نەورەسەکان بە پەڕوباڵی خۆڵەمێشییانەوە پشتیان کردە جۆناسان و هاوڕێکانی، بەڵام جۆناسان گوێی بەوە نەدا. هەر ڕێک لەسەروو شوورای کەنارەوە مەشقی دەکرد. بۆ یەکەم جاریش بە ڕەقییەوە ڕەفتاری لەگەڵ قوتابییەکانیدا دەکرد تا زیاتر هانیان بدات.

جۆناسان قیژاندی: ((مارتنی نـەورەس! تۆ وتت کە فڕینی خێرای نزم دەزانیت. تا ئەو دەمەی نەیسەلمێنیت واتە نایزانی! دەی بفڕە!))

بەمجۆرە، مارتن ویلیەم، نەورەسە بچووک و هێمنەکە، تا لە تیغی نیگای مامۆستاکەی هەڵێ، لە شوێنی خۆی وەها ڕاپەڕی کە خۆیشی سەر سوڕماو، دەستی بە نمایشێکی ئەفسووناویی فڕینی خێرای نزم کرد. لە کزترین شەماڵدا؛ توانیی بۆ گوژم و نیشتنەوەی دووبارە، باڵەکانی بنوشتێنێتەوە بەبێئەوەی لەسەر لمەکەوە تا هەورو، لە هەورەکەوە بۆ سەر لمەکە تاقە جارێک چییە باڵەکانی لێک بدات.

چارلز ڕۆلاندی نەورەسیش لە بڵندایی کێوبای مەزنەوە توانیی بۆ بەرزیی بیست و چوار هەزار پێ بفڕێ‌و، پاشان لە ئاوریشمی هەوای فێنکدا بە سەرسامی‌و شادییەوە دابەزی، لە سەرمانا لەشی شین هەڵگەڕابوو. بڕیاریشی دا کە بۆ ڕۆژی ئایندە بەرزتریش بفڕێ.

فلیچەری نـەورەس، کە هیچ یەکێک وەک ئەو عاشقی هەوا بڕین نەبوو؛ سەرکەوتووانە شانزدەهەمین سووڕانەوەی ئارامی ستوونیی خۆی ئەنجام دا. ڕۆژی دواتریش بە سێ تەقلە سەرکەوتنەکەی خۆی گەیاندە لووتکە و، لەبەر تیشکی خۆرەتاوداو لەبەر دیدەی ئەو نەورەسانەی کەناردا کە بەدزییەوە تەماشایان دەکرد؛ پەڕوباڵە سپییەکەی دەدرەوشایەوە.

جۆناسان بـەردەوام لای یەکێک لە قوتابییەکانی بوو، شتی بۆ ڕوون دەکردنەوە، پێشنیازی دەخستە بەردەمیان، ڕەق بوو لەگەڵیانداو ڕێنوێنیی دەکردن. هەر بۆ سەرگەرمی، لە شەوو هـەورو تۆف و کرێوەدا لەگەڵیاندا دەفڕی و، هاوکات لەگەڵ

ئەمانەدا؛ نەورەسەکانی گەلە بێ دەسەڵاتانە لەسەر زەوی لە دەوری یەکدی کۆدەبوونەوە.

وەختێ فڕین کۆتایی دەهات؛ قوتابیەکان بە ئازادی بەسەر لمەکەدا بڵاو دەبوونەوەو، تا دەهات باشتر گوێیان بۆ قسەکانی جۆناسان شل دەکرد. هزری وا سەیرو بەجۆشی لە کەللەدا بوو کە نەیاندەتوانی لێی حاڵی بن، بەڵام هەرچۆنێک بووایە لە هەندێ لەو هزرانەی تێدەگەیشتن.

* * *

شەوان هێدی هێدی ئەڵقەیەکی دی بەدەوری ئەڵقەی قوتابییەکاندا دروست دەبوو. ئەڵقەیەک لەو نەورەسانەی کە خوازیاری فێر بوون بوون و، لە دوڕ تاریکیدا چەندان کاژێر گوێیان شل دەکردو، نەیاندەویست کەس ببینن یان ببینرێن و پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ ون دەبوونەوە.

ڕێک مانگێک پێش گەڕانەوە بوو کە یەکەم نەورەس گەلەی جێهێشت و ویستی فێری فڕین بێت، ئەم کارە بووە هۆی دەرکردنی تیرانس لۆویلی نەورەس و تاوانبارکردنی بە شکاندنی یاسای گەلە، ئەمیش بوو بە هەشتەمین قوتابیی جۆناسان.

شەوێکی تریش کیرک مایناردی نەورەس لە گەلە دەرپەڕیو بەدەم گاگۆلکێوە لەسەر لمەکە باڵی چەپی بەسەر زەویدا دەکێشاو لەبەردەم جۆناساندا کەوتە سەر چۆک.

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: ((یارمەتیم بدە)). دەتوت لە سەرەمەرگدایە ((لەم دونیایەدا لە هەموو شتێک زیاتر عاشقی فڕینم)).

جۆناسان وتی: ((كەواتە هەڵسەو پێشم كەوە، لەسەر زەوی بەرز بەرەوە و، لەگەڵ مندا بكەوە فڕین، دەی با دەست پێ بكەین)).

((بەڵام ئەی نابینیت؟ باڵم.... ناتوانم باڵم بجوولێنمەوە))

((ماریناردی نەورەس! تۆ ئەو ئازادییەت هەیە كە خودی خۆت بیت، خودی ڕاستەقینەت، لێرەداو هەر ئێستاش. هیچ شتێكیش ناتوانێ ببێتە كۆسپی سەر ڕێت، ئەمەیە یاسای ڕاستەقینەی نەورەسی مەزن)).

((دەتەوێ بڵێی كە من دەتوانم بفڕم؟!))

((من دەڵێم كە تۆ ئازادیت)).

بە ساناییو چاپووكی؛ كریك ماینارد‌ی نەورەس باڵەكانی كردەوە و بێ هیچ خۆماندووكردنێك، لە هەوای شەوی ئەنگوستەچاودا دەستی كرد بە فڕین. گەلە لە قریوەی ئەو ڕاپەڕی، لە بەرزیی پێنج سەد پێوە، تا ئەو ڕادەیەی كە لە توانایدا بوو هاواری كرد: ((من دەتوانم بفڕم! گوێ بگرن من دەتوانم بفڕم!)).

لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا نزیكەی هەزار باڵندە لە دەرەوەی ئەڵقەی قوتابییەكان وەستان و بە تاسوقەوە تەماشای ماریناردیان دەكرد. ئەمانە بەلایانەوە گرنگ نەبوو ببینرێن یا نەبینرێن،

گوێیان شل كردبوو تا پەی بە وشەكانی جۆناسانی نەورەس بەرن.

جۆناسان سەبارەت بە شتی زۆر سادە دەدوا، سەبارەت بەوەی هەموو نەورەسێك مافی ئەوەی هەیە كە بفڕێت و، ئازادی سروشتی ڕاستەقینەیەتیو، هەرچیەك لەبەردەم ئەم ئازادییەدا ببێتە كۆسپ پێویستە لەناو ببرێ، ئیدی ئەو شتە دابونەریت بێ،

یان بیروباوەڕی هیچوپووچ و، یان هەر کۆت و پێوەندێکی دی.
دەنگێک لەنێو ئاپۆرەوە بەرز بۆوە: ((تەنانەت گەر یاسای گەلەش بێ؟))

جۆناسان وتی: ((تاقە یاسای ڕاستەقینە ئەو یاسایەیە کە ئێمە بەرەو ئازادی ڕێنمایی دەکات، بە تەنها ئەمە یاسای ڕاستەقینەیە)).

دەنگێکی دی بڵند بۆوە: ((چۆن چاوەڕێی ئەوە دەکەیت کە ئێمە هەمووومان وەکو تۆ بفڕین؟ تۆ نەورەسێکی بەهرەمەندو خودابیت و، لە باڵندەکانی دی بەرزتریت)).

جۆناسان وەڵامی دایەوە: ((ئەی فلیچەرو لۆویل و چارلز ڕۆلاند! ئەوانیش هەر بەهرەمەندو خوداییین؟ هیچیان لە تۆ زیاتر نیە و، هەروەها منیش. تاقە جیاوازیی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئەوان خەریکن لە ئامانجی بوونی خۆیان تێدەگەن و لەو پێناوەدا کار دەکەن و هەوڵ دەدەن)). قوتابییەکانی جۆناسان، جگە لە فلیچەر، بە گران لەوە حاڵی دەبوون. نەیاندەزانی کە نهێنیی کارەکەیان هەر ئەوە بوو کە ئەنجامیان دەدا.

* * *

ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی نەورەسان لەزیادبووندا بوو، دەهاتن تا پرسیار بکەن و، خەوشەکانی خۆیان بزانن و، فێری شەیدایی بن.

بەیانیەکیان، پاش مەشقی تیژفڕین، فلیچەر بە جۆناسانی وت:

((لە نێو گەلەدا وا باوە کە تۆ ئەگەر کوڕی نەورەسی مەزن نەبیت؛ کەواتە هەزاران ساڵ پێش سەردەمی خۆت کەوتوویت)).

جۆناسان ئاخێکی هەڵکێشا. بیری کردەوە کە ئەوانە لەبەرئەوەی تێناگەن تۆ بە ئەهریمەن یا یەزدان دەزانن.

((تۆ دەڵێی چی فلیچ؟ ئایا ئێمە پێش سەردەمی خۆمان کەوتووین؟))

فلیچەر پاش بێدەنگیەکی درێژ وتی: ((چاکە، ئەم جۆرە فڕینە ئەستەم نییە، هەرکەسێک بیەوێ دەتوانێ فێر ببێت. ئەمە چ پەیوەندیەکی بە سەردەمەوە هەیە. دەشێ پێش دابونەریتە کۆنەکان کەوتبین و، لە دۆزینەوەی شێوازێکی نوێی فڕیندا پێش زۆربەی نەورەسانی دەریا کەوتبین)).

جۆناسانیش کە بۆ پەڕینی پێچەوانەو سووک و کورت سووڕی دەخوارد وتی: ((ئەمە قسەیەکە زۆر باشتر لەو قسەیەی کە دەڵێ ئێمە پێش سەردەم کەوتووین)).

* * *

هەفتەیەک تێنەپەڕی کە کارەساتەکە ڕوویدا. فلیچەر شێوەکانی فڕینی خێرای بۆ دەستەیەک لە قوتابییە تازەکانی نمایش دەکرد. فلیچەر تازە بە گوژمەوە لە بەرزایی حەوت هەزار پێوە دەهاتە خوارو، هەروەکو تیرەستێرەیەکی خۆڵەمێشی چەند پێ لەسەروو کەنارەوە تیژ تێدەپەڕی؛ وەختێ باڵندەیەکی لاو کە یەکەم فڕینی سووکی خۆی فێر دەبوو بەدوای دایکیدا دەگەڕا؛ هاتە بەردەمی، فلیچەر

لیندی نەورەس بۆئەوەی خۆی بەو نەورەسە بچکۆلەیەدا نەکێشێت؛ لە دە یەکی خولەکێکدا زۆر بەتوندی بەلای چەپدا وەرچەرخا. بەخێرایی زیاتر لە دووسەد میل لە کاژێرێکدا خۆی بە گاشەبەردێکی درنال درنالدا دا. دەتوت گاشەبەردەکە دەرگایەکی قورسی دێو ئاسایە و جیهانێکی تری بەڕوودا والا کردووە. ترس و لەرزو تاریکی ڕێچکەی بۆ دەروونی خۆش کرد و، پاشان مەلەئاسا کەوتە ئاسمانێکی پیوارو سەیرو سەمەرەوە، لە یادی خۆی دەبردەوە، بیری دەکەوتەوە، لە یادی خۆی دەبـردەوە، ترساو.. غەمگین و پەشیمان بوو، فرە پەشیمان. سەدایەک وەک سەدای یەکەم ڕۆژی بینینی جۆناسان لە ڕەوانیدا دەنگی دایەوە...

((فلیچەر، هونەر لەوەدایە ئێمە تەقەلا بکەین تا لە کۆت و پێوەندەکانی خۆمان ڕزگارمان بێ.

ئەمەش بە ڕێگایەکی دروست؛ نەک کتوپڕ. هێشتا ماومانە بەنێو گاشەبەردەکاندا گوزەر بکەین.

بەڵام لە ئایندەدا ئەوەش ئەنجام دەدەین)).

((جۆناسان!))

مامۆستاکەی گاڵتەئامێزانە وتی: ((ناوێکی تریشم هەیە؛ کوڕی نەورەسی مەزن)).

((لێرە چی دەکەین؟ گاشەبەرد!! من نەمردووم؟.. ئایا.. من نەمردووم؟))

((ئۆ.. فلیچ، بەسە، بیر بکەرەوە، ئەوەتانێ قسەم لەگەڵ دەکەیت، کەواتە ماویت و نەمردوویت،

وانییە؟ هۆی ئەوە بوو لەپڕێکدا ئاستی بیری خۆت گۆڕی. ئێستاش لە هەڵبژاردندا سەربەستیت؛ دەتوانیت لێرە بەم

ئاستەوە بمێنیتەوە کە گەلێ بەرزترە لەو ئاستەی تێتپەڕاندووە، یان دەتوانیت بگەڕێیتەوەو سەرگەرمی فێرکردنی پۆلە نەورەسەکە ببیتەوە. گەورەکان هیواخواز بوون دووچاری بەڵایەک بووبیت، بەڵام ئێستا هەر ڕووڕەشییان بۆ ماوەتەوە و، نازانن لە داخدا چی بکەن)).

((بێگومان حەز دەکەم بگەڕێمەوە لای پۆلە نەورەسەکە، هێشتا بەگوێرەی پێویست قوتابییەکانم فێر نەکردووە!))

((زۆرباشە فلیچەر، بیرتە کە دەمانوت جەستە بریتییە لەو بیرۆکەیەی کە هەتە دەربارەی..؟))

فلیچەر سەرێکی ڕاوەشاندو باڵەکانی کردەوە و، ناکاو تەماشای کرد بەسەر ئاسمانی مۆڵگەی نەورەسانی گەلەوەیە. کە بۆ یەکەم جار خۆی ڕاتەکاند؛ قریوەو هەراوزەنا لە ئاپۆرە هەڵسا.

((زیندووە! مردبوو! کەچی ئێستا زیندووبۆتەوە! کوڕی نەورەسی مەزن هەر ئەوەندە نووکی باڵی خۆی لێ خشاند؛ ئیتر زیندووی کردەوە!!))

((نەء، ئەوە کوفرە! ئەو نەورەسە شەیتانە! شەیتانەو هاتووە تا یەکێتیی ڕیزەکانی گەلە لێک بترازێنێت!))

ئەم ڕووداوە ترسی خستە دڵی ئەو چوار هەزار نەورەسەوە کە لە دەوری یەکدی خڕ ببوونەوە. واقیان وڕما بوو. هاواری ((شەیتانە!)) وەک زریانی تۆفانێکی دەریایی لە گەروویانەوە بەرز دەبۆوە. چاوەکان گڕیان لێ دەباریو، دەنووکەکان تیژو بڕندە ببوون، نیازیان بوو فلیچەر لەناو بەرن؛ هەموو پێکەوە شاڵاویان هێنا. جۆناسان پرسیی: ((فلیچەر، بەباشی دەزانیت ئێرە جێبهێڵین؟))

((منیش وام پێ باشە)).

لە چاوتروکانێکدا نیومیل لە گەلە دوور کەوتنەوە، گەلە بە حەپەساوی دەنووکی بە باق و بریقیان بەرەو ئاسمانی چۆڵ داچەقاند.

* * *

جۆناسان بەحەسرەتەوە وتی:

((نازانم بۆچی، دژوارترین کار لەم دونیایەدا ئەوەیە باڵندەیەک قەناعەت پێ بکەیت کە ئازادە؟! گەر بۆ ماوەیەکی کەمیش خۆی ئەوە تاقی بکاتەوە؛ دەزانێ کە ئەمە ڕاستە! بۆچی قەناعەتپێکردنی یەکێکی دی بەم حەقیقەتە ئەمەندە دژوارە؟!))

فلیچەر هێشتا هەر چاوی سەرسامیی دەتروکاند، پرسیی:

((تۆ چیت کرد؟ ئێمە چۆن گەیشتینە ئێرە؟))

((ئەی تۆ نەتوت حەز دەکەم لە گەلە دوور بکەومەوە؟))

((بەڵێ بەڵام ئەی تۆ..)).

((ئەمەش مەشقێکی دیکەیە فلیچەر..)).

* * *

تا بەرەبەیان گەلە ئەو بێ ئاوەزییەی خۆی لەبیر چۆوە. بەڵام فلیچەر لەبیری نەچۆوە.

((جۆناسان، بیرتە سەروەختێک چیت دەوت؟ دەتوت دەبێ گەلەکەمان ئەوەندە خۆش بوێت کە بگەڕێینەوە بۆ لایان و

یارمەتییان بدەین تا فێر بن؟))
((بەڵێ)).
((من سەیرم لێ دێ! تۆ چۆن دەتوانیت کۆمەڵێک باڵندەت خۆش بوێ؛ کە ئەوەندە نابێ ویستیان بتکوژن؟!))
((فلیچ.. تۆ ئەو شتەت خۆش ناوێ تیایاندا. بێگومان تۆ ڕقت لە لایەنی بەدی و نەگریسییە تیایاندا، بەڵام دەبێ بزانیت چۆن نەورەسە ڕاستەقینەکەیان تێدا دەبینیت؛ واتە ئەو لایەنی باشیەی کە لە دەروونی هەموویاندا هەیەو، یارمەتییان بدەیت تا ئەو باشییە لە ناخی خۆیاندا بدۆزنەوە. ئەمە تێڕوانینی منە بۆ خۆشەویستی. دۆزینەوەی ئەم ڕێیەش شتێکی جوانە. بۆ نموونە دێتەوە یادم، باڵندەیەکی لاوی سەرسەخت کە ناوی فلیچەر لیندی نەورەس بوو، لە گەلەی خۆی دەرکرابوو، ئامادە بوو تا مردن لەگەڵ گەلەدا بجەنگێو بناغەی دۆزەخێکی تاڵ لەسەر گاشەبەردەکان بۆ خۆی دابڕێژێت، بەڵام ئەوەتانێ ئێستاو لێرە بەهەشتی خۆی خولقاندووە و، ڕابەرێتیی گەلەش دەکات بۆ ئەم ڕێیە)).
فلیچەر تەماشایەکی مامۆستاکەی کردو، بۆ تاوێک ترس لە چاوانیدا نیشت.
((من ڕابەرێتی بکەم؟ مەبەستت چییە؟ من ببمە ڕابەر؟ لێرە تۆ مامۆستایت.. ناتوانیت جێمان بهێڵیت)).
((ناتوانم؟! تۆش لەو بڕوایەدا نیت کە دەشێ گەلەی دیکە هەبن، فلیچەری دیکە هەبن، لە ڕێگایاندا بەرەو ڕووناکی؛ لە ئێوە زیاتر پێویستیان بە مامۆستا هەبێت؟))
((بەڵام من؟ جۆن، من تەنها نەورەسێکی ئاساییم و هیچی تر، بەڵام تۆ...)).

جۆناسان قسەکەی پێ بڕی: ((... تاقانەی نەورەسی مەزنم!))

جۆناسان ئاخێکی هەڵکێشاو ڕوانییە دەریاو وتی:

((تۆ ئیتر پێویستیت بە من نییە. تۆ پێویستیت بە دۆزینەوەی خودی خۆتە، هەر ڕۆژەو شتێک زیاتر. نەورەسە ڕاستەقینەکە؛ واتە فلیچەر، نەورەسە ئازادەکەی ناو ناخت، ئەو مامۆستایەی تۆیە. تۆ پێویستیت بە ناسین و تێگەیشتن و ئەزموونی ئەوە)).

پاش تاوێک، جەستەی جۆناسان لە هەوادا شەپۆلی دەدا و، بە نوورێکی کزەوە دەبریسکایەوە و، ئینجا وەک قەوارەیەکی تەنک هاتە بەرچاو. وتی: ((مەهێڵە سەبارت بە من واتەوات بڵاو بکەنەوە.

مەهێڵە من بە خواوەند بزانن. باشە فلیچ؟ من تەنها نەورەسێکم و حەز بە فڕین دەکەم، دەشێ..)).

((جۆناسان)).

((فلیچی ئازیزم، باوەڕ بەو شتە مەکە کە چاوەکانت پێتی دەڵێن. تەواوی ئەو شتانەی چاوەکانت پیشانتی دەدەن بەندو داوو سنووردارن. بە چاوی ئاوەز بڕوانە. هەوڵ بدە پەی بەو شتانە بەریت کە دەیانزانیت، ئەو دەمە دەتوانیت ڕێی حەقیقەت ببینیتەوە)).

چریسکەی نووره کزەکە نەما. جۆناسانی نەورەس لە بۆشایی ئاسماندا ون بوو.

* * *

پاش ماوەیەکی کورت، فلیچەری نەورەس بەرەو ئاسمان باڵی لێک ناو، گەیشتە کن دەستەیەک قوتابیی نوێ کە لە گەلە دەرکرابوون و تامەزرۆی یەکەم وانە بوون.

بەسەنگینییەوە وتی:

((سەرەتا دەبێ ئەوە تێبگەین کە هەر نەورەسێک خەیاڵێکی بێ سنووری ئازادییە، وێنەیەکە لە نەورەسی مەزن، سەرانسەری بەدەنی ئێوەش؛ واتە لەم نووکی باڵەوە تا ئەو نووکی باڵتان؛ شتێک نییە جگە لەو بیرۆکەیەی هەتانە دەربارەی جەستەی خۆتان)).

نەورەسە لاوەکان بە سەرسامییەوە تەماشایان دەکرد. بیریان کردەوە؛ ئەم قسانە فەرمانێک نین بۆ فڕین بەدەم سووڕانەوەوە.

فلیچەر ئاخێکی هەڵکێشاو کەمێک لە نەورەسەکان ڕاماو بەردەوام بوو:

((هوم.. ئاە.. زۆر چاکە.. دەی با دەست بە فڕینێکی نزم بکەین)).

کە ئەم قسەیەی کرد، ناکاو قسەکەی جۆناسانی بیر کەوتەوەو، تێگەیشت کە مامۆستاو هاوڕێکەی هەروەکو ئەم خۆیشی، نە قدیس بووەو نە خواوەند. لە دڵی خۆیدا قسەی بۆ جۆناسان کرد.

((سنوورێک لەئارادا نییە جۆناسان! کەواتە باشە، کاتێک دێ دەڕۆم تا لە ئاوریشمی هەوادا گوزەر بکەم و لە کەنار تۆدا دەربکەومەوە و یەک دوو هونەری فڕینت پیشان بدەم، ئەو کاتەش هێند دوور نییە!))

ئیدی بەمجۆرە دەیویست وەک مامۆستایەکی

بەزەبروزەنگ لەبەرچاوی قوتابییەکانی خۆی بنوێنێت، بەڵام ناکاو فلیچەری نەورەس؛ نەورەسە ڕاستەقینەکەی ناو ناخی قوتابییەکانی بینی. بەم دیمەنە دڵی سەرشار بوو لە عیشق و خۆشەویستی.

بیری کردەوە... ((سنوورێک لەئارادا نییە، جۆناسان)).

ئینجا زەردەخەنەیەکی هاتێ و نەبەردەکەی بۆ فێربوون دەستی پێ کرد.

